
چۆن
تام و چێژ وەربگرین
لە
عیبادەتمان
باوکی عبد الله

# چۆن تام و چێژ وەربگرین

# لە

# عیبادەتمان

١٤٤٤



الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خاتم النبيين محمد وآله وصحبه والتابعين إلى يوم الدين. أما بعد...

اللهم أحسن عاقبتنا في الأمور كلها وأجرنا من خزي الدنيا وعذاب الآخرة

هەر عیبادەتتێك ئەگەر لە زەتی تیا نەبێ ئینسان بەردەوام نابێ لەسەری وە روحی عیبادەتتیش تامكردنە لە لەزەتی عیبادەتتەكە، عیبادەتتی عاشق لەگەڵ مەعشووقەكەی دووی شەو سێی شەو كە لەگەڵ كچێك هەڵدەستێ قسە دەكات ئەو پەڕی تام و چێژی لێ دەبینێ بە ڕۆژیش بەردەوام دەبێ لە قسە كردن لەگەڵیدا سەنتی باشی بۆ تێ ئەكا نەوەكو لە قسەكانیان دابڕێن چونكە تام و چێژی لێ دەبینن، كابرا لەسەر فەیسبووكە بەهەمان شێوە تام و چێژەی لێ ئەكا، ئەگەر قیاسی بكەین ئەم لەززەتەیش لەگەڵ خوای ﷻ بیكات، كاتێ دەچێتە ناو نوێژ حەز نەكات سەلام بداتەوە، كە بەڕۆژوو بێ حەز نەكات بیشكێنێ كە زیكری خوای ﷻ كرد حەز نەكات بووەستێ، ابن القيم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (مامۆستاكەم لە داوای نوێژی بەیانی هەتا مردیش كە سەلامی ئەدایەوە هەتا نیوەی رۆژ لە شوێنی خۆی نەدەجووڵا هەتا مردا! بە شێخەكەمم وت : ماندوو نابی؟ فەرمووی : ئەمە خواردنی دڵمە ئەگەر هەموو ڕۆژێك نەیخۆم ناتوانم بڕۆم) لەبەر ئەوە ئەگەر لەززەت چووە ناو عیبادەتت مەحاڵە ئەو كەسە بتوانێ جیابێتەوە كە جیابووە خەم ئەخوا، دەگریی، منداڵێك هەبوو مامۆستاكەی وتی: نوێژی جەماعەت خێری زۆرە بە تایبەت نوێژی بەیانی، دەڵێ:

منداڵبووم ئەم دەوێرا بچمە مزگەوت ووتم: خوایە بۆمی ئاسان بکە ئەڵێ: دەچووم لای دەرگا دەوەستام تا نوێژی بەیانی گوێم لە تەپەی نەعل بوایە دەرگام ئەکردەوە لە دوای ئەڕۆیشتم کە پیرەمێردێك بووا ئەڵێ: ماوەیەك لە دوای ئەم شێخە نوێژم کرد دواتر وەفاتی کرد دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ گوێم لە تەپەی نەبوو ڕۆژێك بەیانی بووەوە ئەو منداڵە زۆر بە توندی دەگریا لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانی لەدەست چووە لەبەر ئەوەی لەززەتی لە عیبادەتتەکە کردوە ، ئەو هۆکارەیش نەما کە بیبا بۆ نوێژەکەی، باوکی پرسیاری لێ کرد ئەی کوڕم بۆ ئەگری وتی: کەس نیە بمبا بۆ نوێژی بەیانی ، باوکی کەسێکی نوێژ نەکەر بوو لەوێدا شایەتمان دەهێنێ و دەڵێ کوڕەکەم لێرە بە دواوە من دەتبەم بۆ نوێژی بەیانی، بۆچی منداڵەکە ئەگری؟ چونکە لەززەتێکی عیبادەتی لەدەست چووا.

کاتێك هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ چوون بۆ غەزوەیەك هەندێك لە فەقیرەکانیش هاتن ، داوایانکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ با ئێمەش بێین ، بەڵام کاتێك کە مەجال نەبوو ئەو چەکە نەبوو بیانداتە دەستیان ﴿تَوَلَّوا۟ وَّأَعۡیُنُهُمۡ تَفِیضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا﴾(التوبة:٩٢) ئیتر ئەوانیش بەوحاڵەوە لای تۆ گەرانەوە و چاویشیان لە خەم و خەفەتا بەلێشاو فرمێسکی دەڕشت.

گەڕانەوە نەك فرمێسك بەڵکو فەیزانێك فرمێسکیان ڕشت چونکە نەیانتوانی بەژداری ئەم پاداشتە زۆرە بکەن. لەبەر ئەوە یەکێك لە نیشانەی ئەوەی کە تامت لە عیبادەتت کردووە ، ئەوەیە ئەگەر هەر عیبادەتتێکت ڕۆیی بۆی بگری! حەسرەت بەرت نەدا ئەو ڕۆژە هەتا وەکو ئەو عیبادەتتە دەکەیتەوە .

ئەمیر مؤمینین عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ کە نوێژی عەسری بە جەماعەت ڕۆیی یەك باخچەی دووسەد ملیۆنی ئێستا دەکات بەخشی، یەك نوێژی جەماعەت کە نوێژەکەیشی نەچوو بەڵکو تەنها جەماعەتەکەی ڕۆشت، ئینجا لەسەر وەرەقەیش نووسی بۆم بخەنە ناو قەبر بۆ ئەوەی ببێتە کەفارەتی ئەوەی کە جەماعەتەکەم ڕۆشت. ئێمە هەفتەی چەند جەماعەتمان تاخیر دەبێ لەسەر چی عوزرێك تاخیر دەبێ، لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان بۆ ئەوەی بگا بەو لەززەتە حەتمەن ئیسلام دینێکی تایبەتە وەکو دینەکانی تر نیە اللّٰه ﷻ کە فەرمانت پێ ئەکا بەڵکو ڕێگەکەیشت پێ نیشان ئەدا. کە ئەفەرمووێ: بەهەشت خۆشە ڕێی بەهەشتیشت پێ نیشان ئەدا، کە باسی لەززەت ئەکا اللّٰه ﷻ یان محمد ﷺ یان صحابە یان سەلەف پێت ئەڵێن: بەو ڕێگایانە ئەگەی بەو شتە. پێغەمبەری ﷺ ئەفەرمووێ (عن العباس بن عبد الطلب ﵁أنه سمع رسول اللّٰه ﷺ يقول: ذاق طعم الإيمان من رضي باللّٰه ربا، وبالإسلام دينا، وبمحمد رسولا عليه الصلاة والسلام) (مسلم:٣٤) شیرینی ئیمانی چەشتووە ئەو کەسەی ڕازی بێت اللّٰه پەروەردگاری بێت، ئیسلامیش دینی بێت، محمد ـیش پێغەمبەری بێت ﷺ.

یەکەم خاڵ بۆ ئەوەی تۆ ئەو پەڕی تام و چێژ لە عیبادەت وەربگری ڕازی بوون بەوەی کە اللّٰه ﷻ خوات بێت . کێ هەیە لێرە ڕازی نیە کە اللّٰه خوای بێت ؟ کەس هەیە ؟ بە قسە نیە ! ئەی ئەگەر بێتە سەر عەمەل؟ کابرایەك تەوافی دەکرد وتی: یارەبی خوایە لێم ڕازی بی ، ئیمامی شافعی رەحمەتی خوای لێ بێ دەستێکی لە پشتیدا وتی: تۆ لە خوا ڕازیت ؟ فەرمووی: ئەی ئیمام کەس هەیە

لە خوا ڕازی نەبێ؟ ئەویش فەرمووی: زۆر کەس هەیە لە سەر زەوی ئێستا لەخوا ڕازی نیە، وتی: چۆن ئەی ئیمام ؟ فەرمووی: خوای گەورە تاقی ئەکاتەوە ئەڵێ خوایە بۆ تاقیت کردمەوە؟ کاتێك کە لێی گرتەوە دەڵێن: ﴿فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ﴾ (الفجر:١٦)پەروەردگار ڕقی لێمانە و ڕیسوای کردووین.

خوایە منت فەقیرکرد ئیهانەت کردم ، فڵانە کەس چی لە من زیاترە کە هەیبێ ؟ کەواتە تۆ ڕازی نەبووی کە اللّٰه ﷻ خوات بێ ، تۆ کە ڕازی بەوەی کە اللّٰه ﷻ خوات بێ ئەبێ ڕازیبی بە قەدەری خوا. عبد اللّٰه ی کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەفەرمووێت ( أن العبد لا يذوق طعم الإيمان حتى يؤمن بالقدر) بێگومان هیچ بەندەیەک شیرینی ئیمانی نەچەشتووە تاوەکو ئیمان بە قەدەر نەهێنێ.

بە اللّٰه هیچ کەسێك تام و لەززەت لە عیبادەت ناکات تاکو باوەڕ بە قەدەری اللّٰه ﷻ نەهێنێ، بە تایبەت ئەوەی کە ئەدۆڕێ لە موسڵمانان لە بابی قەدەرا ئەدۆڕێ ، ئەفەرمووێ: (بابی شیرك لە نوێژ خوێنان بووە!. ئەفەرموون: یارسول اللّٰه چۆن؟ فەرمووی : قەدەری خوای ﷻ بە درۆ دەخەنەوە)، یاخود ڕخنەیان هەیە، یاخود پێیان ناخۆشە لەو دابەشکردنەی کە خوای گەورە کردوویەتیی، پێی ناخۆشە دەڵێ بۆ فڵانە کەس دکتۆرا دەهێنێ من نەیهێنم ! فڵانە کەس لە من دەوڵەمەند تر بێ، فڵان لە من لە پێش تر بێ. ئەمە هەموو ڕەخنەیە، ڕازی نەبوونە بە قەدەری خوا، ڕازی نەبوونە بەوەی اللّٰه خوای بێ، مەسەلەن تۆ ڕازیبی بە فکرەیەکی غەیرە ئیسلام ڕازی نەبێ بە ئیسلام.

خوای عَزَّوَجَلَّ ئەفەرمووێ: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾ ئیسلامیش بە بەرنامە و ئاین بۆ هەڵبژاردن و نابێ هیچ کاتێک لێی لابدەن.

ئەگەر تۆ بتەوێ لە خوا ڕازیبی دەبێ لە ئیسلام ڕازیبی کاتێك غەیری ئیسلامت هەڵبژارد واتە غەیری خوات هەڵبژارد و لە خوا ڕازی نەبووی ، ئەو کاتە تامەکە نەما و دەڕوات.



## چۆن تام و چێژ لە عیبادەتەکانمان وەربگرین؟

**یەکەم خاڵ:** موسڵمان کە بیەوێ تام و چێژ لە عیبادەت وەربگرێ ئەبێ ڕازیبێ بە خواکەی ﷻ بە دینەکەی بە قەدەرەکەی بە درووست کراوەکانی بە هەموو شتێك، کە خوای گەورە عەبدەکانی تاقی دەکاتەوە بە باش و بە خراپ . ئەگەر ڕازی بووی ئەو کاتە خۆشەویستیت بۆ درووست دەبێ، تۆ هەر خۆشەویستیەکیش کە هەتبێت ، خوابێ یان غەیری خوابێ ﷻ خۆشەویستەکەت ئەگەر ئەزیەتیشت بدات هەر خۆشت دەوێ و لێ ڕازیت. ئەگەر بگەیت بەو لەززەتە هەرچی ناخۆشیەکیشت بەسەر بێ لەبەر خوای ﷻ لات لە هەنگوین شیرین ترە.

شیخ الاسلام ابن التیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێ بیست ساڵ لە زیندان بوو، بیست ساڵ! کێ ئەتوانێ بیست ڕۆژ لە زیندان بێ بێزار نەبێ؟ بیست ساڵ وتیان: یا شیخ بێتاقەت نەبووی؟ فەرمووی: من بەهەشت لە سینگمە، دەمکوژن شەهیدیە، دەرم ئەکەن گەشت و گوزارە، وە سجنیشم بکەن شوێنی خەلوەتی منە شوێنی خواپەرستی منە. ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: عادەتی قوتابی وابوو پێشتر، وەکو قوتابی و مامۆستای ئێستا نەبوون، ئەڵێ: هەر کاتێ مامۆستاکەم بگیرایە یەکسەر دەچووم محازەرەم ئەدا بۆ ئەوەی لەگەڵ مامۆستاکەم بچمە زیندان پاشان ابن القییمیانیش بردە زیندان ، دەی فەرموو: چۆن دەبێ مامۆستا کەم لە زیندان بێ منیش لە دەرەوە بم، ئینجا دەفەرموون:

ئێمە لە زینداندا ئیمانمان دا ئەبەزی ئەچووینە لای شیخ الاسلام رەحمەتی خوای لێ بێ ئەویش ئامۆژگاری دەك دین، دەیفەرموو: کە زانیان شیخ ئیسلام ئیمانمان بە قووەت ئەکات لە ئێمەیان جیاکردەوە، دوایی دەنگمان پێی دەگەیشت دەفەرموون: بەس دەستی لە دیوار ئەدا ئێمە ئیمانمان وەکو چیایی لێ دەهات فەقەد بەبێ قسە بەس دەستی لە دیوار ئەدا!.

بیست ساڵ شیخ الاسلام رەحمەتی خوای لێ بێ لە زیندان بوو. شیخ الاسلام نە ماڵ و نە منداڵی هەبوو، نە خانووشی هەبوو، تەنها یەك غورفەی هەبوو لە تەنیشت مزگەوتێك بەڵام خۆشەویستی خوای ﷻ چووە دڵی، هەرچی ناخۆشیەکت بەسەر بێت لە پێناو خوای ﷻ لات شیرنە .

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ﵁ هەردوو چاوی لە دەستدا لەهەمان کاتیشدا هەموو دوعاکانیشی قبوڵ بوو، پێیان فەرموو: دوعا بکە تا خوای ﷻ چاوەکانت چاك بکاتەوە، فەرمووی: من جاهیلم خوا حەکیمە بە حیکمەتی خۆی چاومی لێ سەندەوە دیارە خێر لەوەیە کە چاوم نەبێ، لەززەت لەوە دەکا کە چاوی نەبێ چونکە خوا تاقیدەکاتەوە، چەند گرینگە ئەو لەززەتە لە مرۆڤدا، بەس لە عیبادەتت ئەو لەززەتە نەکەی بەڵکو بگەی بەوەی لە غەیری عیبادەتیش ئەو لەززەتە بکەیت.

ئافرەتێك دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ: (أتت النبي ﷺ قالت: إني أصرع وإني أتكشف، فادع اللَّه لي، قال: إن شئت صبرت ولك الجنة، وإن شئت دعوت اللَّه أن يعافيك قالت: أصبر، قالت: فإني أتكشف فادع اللَّه أن لا أتكشف فدعا لها)(مسلم:٢٥٧٦) واتا:سەرعم هەیە یانی جنم هەیە تووشی سەرع دەبووم،

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حەز ئەکەی دوعات بۆ ئەکەم چاك ئەبیتەوە حەزیش دەکەی سەبر بگرە (ولك الجنة) بەهەشتت بۆ هەیە ! فەرمووی یا رسول اللّٰه بەهەشتم ئەوێ. ئەوانە وابوونە هەر گوێیان لە ناوی بەهەشت بواییە هەرچی هەیان بواییە بەلایان دەنا لە خۆشی دنیا بە لە شساغییەوە چونکە ئەوان دەیان زانی بەهەشت یانی چی ، وەکو ئێمە نین وا بەسادەیی وەریبگرن. فەرمووی: یارسول اللّٰه بەهەشتم ئەوێ واتا لەززەتی لێ وەردەگرت هەتا مرد تووشی سەرع دەبوو، فەرمووی: دوعایشم بۆ بکە کە تووشی سەرع ئەبم جلەکانم لەبەر نامێنێ من ئافرەتم، فەرمووی یا اللّٰه عەیبی داپۆشی، خوای ﷻ داپۆشی بەس هەر بەو نەخۆشیەوە مایەوە، بۆ؟ چونکە تامی لێ دەکا!، چەند کەس لە ئێمە ئەگەر تۆزێك گەرمای بێ هەزار ڕەخنە دەگرێ لە ناو نوێژیشدا ! واتا لەززەتی نوێژ ئەوەندە نیە مەژغوڵی بکا لە گەرماکە، وەکو ئەو ئیمامانەی پێشتر شتێکیان لە پێش دائەنا کەسەلامی ئەدایەوە ئەیان ووت: ئەی ئیمام ئەو وەرەقەمان لە پێشت دانا نەتبینی ؟! فەرمووی چ نوێژێکە من بزانم چیم لە پێشە ؟! چونکە ئەوان ئەوەندە لەززەتیان لە موناجاتی خوای ﷻ دەکرد بۆیە ڕازی بوون بە خوا، وە ڕازی بوون بە خوا بەوەی کە چیت بەسەر دەهێنێ ، هەر ناخۆشیەکی کە بەسەر هات ئەبێ تۆ مەمنوونی خوا بی چونکە تاقیکردیتەوە و ئەو کارە خێری تیایە بۆت .

هەموو جارێ بانگخوازێک لە کەناڵی الرحمة دەردەکەوێت و ئەفەرمووێ : خەڵك بۆ تووڕە دەبی لە قەدەری خوا؟ تووڕە نابێ لە قەدەری دکتۆرێك! کوڕی خۆی دەداتە دەست دکتۆر چەپ و ڕاستی ئەو منداڵە شەق و پەق دەکات هەرچی ئێسقان و دەمارەی هەیە هەمووی دەبڕی دوایی دەیدوورێتەوە و دەڵێ: دکتۆر ئەوە هەشتا وەرەقەی عەمەلیاتەکەت خوا خێرت بنووسی دەستیشت خۆشبی! ئەڵێ: خوا حەکیم ترە یان دکتۆرێك؟ تۆ بۆ پارەت دایە دکتۆر چونکە تۆ دڵنیایی کە دکتۆرەکە ویستی خێری هەیە، بەڵام خوای ﷿ کە شتێك بەسەر عەبدەکانی دەهێنێ ئەبێ چەند ویستی خێری هەبێ؟ دوو مەلائیکەت ئەچنە لای خوای ﷿ ئەڵێن یارەبی خواییە فڵانە کەس زۆر موتتەقیە زۆر لە خواترسە بەس فەقیرە ، ئینجا خوای ﷿ دەفەرمووێ: چیتان ئەوێ ؟ ئەڵێن خوای گەورە دەوڵەمەندی بکە ، خوای ﷿ دەفەرمووێ: مەلائیکەتەکانم ئەگەر دەوڵەمەندی بکەم کافر ئەبی کە دەفەرموێت: (إن من عبادي من لا يصلح له إلا الفقر)(الألباني:١٧٧٤) هەندێك لە عەبدەکانی من هەیە ناتوانن من بپەرستن بە فەقیری نەبێ دەوڵەمەندی کەم کافر دەبێت!. کابرایەك شەش مانگان گیرا لای صەدام لەسەر دینی خوا ئەنواعی تەعزیبیان دا، بەڵام لەسەر لااله الاالله گەرمتر بوو، کە بەربوو خوای ﷿ بە دونیا تاقی کردەوە ، هەفتەی یەکەم وازی لە نوێژی جەماعەت هێنا، هەفتەی دووەم وازی لە نوێژی جومعە هێنا، هەر بە ماوەیەکی کەم دواتر چووە سەر عارەق و زینا هەر بەو شێوەیە وەفاتیشی کرد خوا پەنامان بدا.

خوای ﷿ ئەفەرمووێ: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦﴾ واتا: قەت تەمەننای شتێك مەکە کە خوای ﷿ لێی سەندیتەوە. پرسیاریان کرد لە زانایەك ئایا خوا بتداتێ

خۆشترە یان لێت بگرێتەوە؟ فەرمووی: هەر کامێك خوای گەورە مەعامەلەی لەگەڵ کردی ئەوە خۆشە ، ئەگەر دای پێت خۆشیەکە لەوەیە کە پێت بدات ئەگەر لێی گرتیتەوە خۆشیەکە لەوەیە کە نەتداتێ. بەس گرنگ ئەوەیە بزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ اللّٰه ﷻ بکەی.

**خاڵی دووەم:** بۆ ئەوەی کە تام و چێژ بکەی لە عیبادەت (رضي بمحمد ﷺ نبيا) چەند کەس ڕازیە کە محمد ﷺ پێغەمبەری بێت؟ هەموو خەڵك ڕازیە کە محمد ﷺ پێغەمبەری بێ، بەس لەبابی عەمەلی وایە؟! بەتەئکید وانیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ: وابکە ئەو دەچێ پێچەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکا.

ڕازی بوون بە محمد ﷺ یەکەم خاڵ ڕازیبی بە محمد عەقیدەکەیەتی، ئەبێ ڕازیبی بەو دینەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی، بەو شەرعەی کەوا هێناویەتی بۆ خەڵك، ئەگەر ڕازی بووی بەو دینە ئەوە ڕازی بووی بە محمد ﷺ.

ئینجا ڕازی بوون بە ئەخلاقەکەی وە شوێنکەوتنی، خۆشەویستنی محمد ﷺ مەرجە بۆ خۆشویستنی خوا و خۆشویستنی خوایش مەرجە بۆ لەززەتی عیبادەت خوای گەورە ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي﴾(ال عمران:٣١)

خۆشویسنی محمد ﷺ، ڕازی بوون بە محمد ﷺ شوێن کەوتنیەتی، واتا تۆ نابێ شوێن غەیری محمد ﷺ بکەوی.

خەڵکی ئێستا هەمووی شوێن غەیری محمد ﷺ دەکەوێت، کاتێ خۆپیشاندان دێت دەنگ بۆ گەورەترین تاغوت دەدات، لەو لایەش ئەڵێ محمد قائیدمە، تۆ

ئەگەر محمد ﷺ بە قائیدەی خۆت بزانی نابێ بە غەیری محمد ﷺ ڕازیبی کە قائیدەت بێت ، خراپتریش ئەگەر ئەو قائیدە سەرکردەیەکی عەلمانی بێ بێدینیش بێ. لەبەر ئەوە ڕازیبوون بە محمد ﷺ خاڵێکی زۆر زۆر گرینگە بۆ تام و چێژ لە عیبادەت ، هەر تەنها ناوهێنانی پێغەمبەر ﷺ خۆی لەزەتێکی تایبەتی هەیە .

صەحابەیەك هەبوو ناوی سەوبانە: ( ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺبینی زۆر ڕەنگی تێك چووە، پێغەمبەری خوا ﷺفەرمووی : یا سەوبان بۆ وا ڕەنگت تێك چووە نەخۆشیت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺنەخۆشم بەس نەخۆشی تۆمە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خێرە چیتە؟ وتی: واللّٰه ئەمڕۆ تۆم نەبینیوە خەریکە ڕوحم دەردەچی. چونکە ئەوەندە لەززەتیان لە بینینی پێغەمبەر ﷺئەکرد. بۆیە کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد دوعای کرد وتی: خوایە هەردوو چاوم ببەوە چونکە من چاوێکم ناوێ محمد ﷺنەبینێ لێرەوە ! بیلال ئەو شوێنەی جێهێشت ! ، ئیمامی علی رضي الله عنه لە حەدیسی صەحیح هاتووە لەو ڕۆژەدا ئەڕۆیی دەکەوت! ئیمامی عومەر رضي الله عنه دەیفەرموو: ئەوەی بڵێ محمد ﷺ مردووە شمشێر ئەدەم لە ملی ! ، ئەوان بەم شێوەیە لەگەڵ محمد ﷺ بوونە، ڕازی بوون بە محمد ﷺ. بۆیە کاتێك کە خوبەیب لە سەرەمەرگە پێی ئەڵێن: ڕازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنت بی؟ ئەڵێ: ڕازی نیم لە ماڵەوە یەك دڕك بچێتە قاچی پێغەمبەری خوا ﷺ! لەبەر ئەوەی ئەوان تامیان لە خۆشەویستی محمد دەکرد، ڕازی بوون بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

**خاڵی سێیەم :** ڕازی بوون بە ئیسلام ڕازی بی بەوەی کە ئیسلام دینت بێ (بالإسلام دینا) ڕازی بوون بەوەی ئیسلام دینت بێت، تۆ کاتێك لە ئیسلام ڕازی ئەگەر غەیری ئیسلام بە کوفر بزانی!!! کاتێك ئیسلامت خۆش ئەوێ ئەگەر ڕقت لە غەیری ئیسلام بێت کاتێك دڵت بە ئیسلام خۆشە ئەگەر دڵت تەنگ بوو بە فکرەیەکی عەلمانی بۆگەن! واتا: ڕازی بوون بە ئیسلام بەس بە قسە نیە .

ئیسلام هەمووی کردارە، هۆکاری دەوێ هەر شتێك بڵێی: خوای ﷻ داوای هۆکارت لێ دەکا! ئێستا ئەڵێی خوای گەورەم خۆش ئەوێ، خوای ﷻ ئەفەرمووێ: شوێن پێغەمبەری خوا بکەوە بۆ ئەوەی بڵێم ڕاست ئەکەی.

ابن کثیر رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: هەر کەسێ بڵێ خوام خۆش ئەوێ شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوێ درۆ ئەکا لەگەڵ خوای ﷻ لەبەر ئەوە بە قسە نابێ .

**خاڵی چوارەم:** یەکێك لەو خاڵانەی چێژی تەواو ئەدا بە مرۆڤ: ڕۆچوونی ئیمانە بە ڕۆژی دوایی، ئەم جۆرە ئیمانە دوو جۆر .

ئیمانێك هەیە (تمدد)ە ، ئیمانێك هەیە (تعمق)ە، ئیمانی تەمەدود لەوانەیە دە بۆ پانزە ساڵ لە ناو دینە بەس دین لەناو دڵی نیە ! کەسێکیش هەیە دە بۆ پانزە دەقیقە دێتە ناو دین وەکو ساحیرەکانی فیرعەون زۆر بەیەقینی دەچێتە ناو دڵی، فیرعەون ئەوەندە تەهدیدیانی کرد سەرتان ئەبڕم قاچتان ئەبڕم بەداری خورما هەڵتان دەواسم ، بەڵام یەك قسە دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٤٧ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٤٨﴾ بێ منەتن لە فیرعەون کە شەش سەد هەزار جەیشیشی هەبووە لە

ڕیوایەتێکدا هاتووە کە ویستی موسا ﷺ بکوژێت لە کاتێکیشدا پانزە دەقە ئیمانیان هێناوە بێ منەتیشن لە فیرعەون، خوای گەورە ئەفەرمووێت:

﴿فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ﴾ لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان ئەبێ باوەڕی بە قیامەت بەقووەت بێت لەزەتێکی زۆری لێ دەکات تام و چێژێکی تایبەتی ئەکات، ئەوەی کە تامت ئەداتێ لە عیبادەت لیقای خوای ﷻ، لیقای خوایش لە کوێ دەست دەکەوێ ؟ لە ئاخیرەت!. واتا تۆ چەنێك ئیمانت بە ئاخیرەت بەقووەت بێ ئەوەندە زیاتر تام و چێژ لە عیبادەتت وەردەگری بەتایبەت ئەوانەی کە شەونوێژ ئەکەن، خاڵی سەرەکی وایان لێ ئەکات کە شەونوێژ بکەن ئیمانیان بە ئاخیرەتە .خوای ﷻ کە باسی ئیمامی عوسمان ﷺ ئەکات ئەفەرمووێ:

﴿أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦ﴾

چی وای لێکرد لە شەو نوێژ بووەستێ؟ ترسان بوو لە قیامەتێکی سەختدا! پاشان ئەفەرمووێ: ﴿قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾

ئەو کەسەی کە شەو هەڵ ئەستێ شەو نوێژ ئەکات قسە ئەکات لەگەڵ خوای ﷻ وەکو کەسێکی خەوتووی وەك ئێمەیە؟!! دوو شتی لێك جیان، تابیعیەك ئەفەرمووێ: لە شوێنێکدا ئەڕۆیشتین بە بەلەم گەیشتینە سەحرایەك بەلەمەکەمان جێگیرکرد، بینیمان کابرایەك بە تەنها لەوێ بت دەپەرستێ! ئیتر بەکورتی باسی خوامان بۆ کرد موسڵمان بوو! کە هاتە ناو بەلەمەکە ئینسان ئەگەر ئیمان بچێتە دڵی بەم شێوەیە یەکسەر لەززەت لە دینەکەی وەرئەگری، پارەیان بۆ کۆکردەوە دایان پێی وتی: ئەو پارەیە بۆ کێیە؟ وتیان: بۆ تۆیە! وتی: من

چەند ساڵە بت دەپەرستم خوا رسقم ئەدا ئێستا خوای بەحەق دەپەرستم ئێوە پارە بۆ من پەیدا دەکەن؟ پێویستم بە پارەی ئێوە نیە خوای گەورەی خۆی رسقم ئەدا .کە شەو داهات مامۆستاکە پێش هەمووان خەوت ، وتی: زەحمەت نەبێ مەخەوە، وتی: یەك پرسیارم هەیە ئەو خوایەی کە ئێوە ئەیپەرستن دەخەوێ ؟ وتی: نەوە اللّٰه، کابرا وتی: وە اللّٰه ی خراپترین قەوم ئەو قەومەیە کە خواکەی نەخەوێ ئەو بخەوێ ! تازەیش ئیمانی هێنابوو ، واتا: ئەو بوو بە مامۆستای مامۆستاکەی، بەس چونکە ئیمانەکە چووە دڵی تام لەوە دەکات کە نەخەوێت! لەبەر ئەوە ئەو تامە زەرووره ئەو تام و چێژە وا لە ئینسان ئەکات کە شەو نوێژ بکات ، بەڵام ئەگەر ئەو تامە نەما ئیتر تامی خەو دێ ئەو خەوەشی کە لە ڕەمەزاندا زاڵ بووە بەسەرماندا! بۆیە ئینسان ئەبێ هەوڵبدا کە ئیمان بە ئاخیرەت بهێنێت.

**خاڵی پێنجەم:** کە زۆر زۆر زەرووره دوورکەوتنەوە لەو شتانەی کە دڵ ڕەق دەکات، یەکەم شتیش لەو شتانەی کە دڵ ڕەق دەکات خۆشویستنی دونیایە وە سەرووی هەموو گوناهێکە، یانی خۆشویستنی دونیا سەری هەموو گوناهێکە بۆیە ئینسانی موسڵمان ئەبێ ئاگای لەوە بێ کە تووشی خۆشویستنی دونیا نەبێ .

**خاڵی شەشەم:** کەوا زۆر زۆر لەززەتت پێ دەدا ئەویش دوعایە، زۆر دوعا بکەن خوای ﷻ خۆی تامی عیبادەت و لەزەتی عیبادەتتان ئەداپێ ، دوعا چەکێکی یەکجار بەهێزە زۆر دوعا بکەن لە خوای ﷻ بپاڕێنەوە، وەکو تابیعیەکان کە دوعایان دەکرد: (اللهم إني أسألك أركانا قوية على عبادتك، وأسألك جوارح مسارعة إلى

طاعتك، وأسألك هَمّا متعلقة بمحبتك)دوعای سەلەف زۆرە لەسەر ئەو شێوەیە، بەتایبەت ئەو دوعایەی کە ئەفەرموون: (اللهم ارزقني حبا لك، وحبا لطاعتك، وحبا لمطيعك، وحبا لأوليائك، وحبا لأهل محبتك وخدمتك، اللهم ارزقني حبا ترفعني به عندك في أعلى درجات العلى في منازل المحبين لك) دوعای داود پێغەمبەرە ﵇ وە دوعای پێغەمبەر محمدیشە ﷺ .هۆکاری تر زۆرە ئەگەر ئینسان جێبەجێی بکات خوای ﷻ ئەو لەززەت و عیبادەتەی ئەداتێ وەکو لە حەدیسی تریشدا هاتووە. سێ شت ئەگەر لە هەر کەسێکدا هەبێ خوای ﷻ خۆی لەزەتی ئیمانی ئەداتێ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان: أن يكون اللّٰه ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا للّٰه، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه اللّٰه منه كما يكره أن يقذف في النار.) (البخاري:١٦)یانی خوای ﷻ وە پێغەمبەری خوات ﷺ لە هەموو کەس خۆشتر بوێت وە ئەگەر موسڵمانێکت خۆشویست لەبەر خوا خۆشت بوێت لەبەر مەسلەحەتێکی دنیای نەبێت، وە پێت ناخۆش بێ هەڵبگەڕێیتەوە لە دین تووشی کوفر و ریددە بی دوای ئەوەی خوای ﷻ ڕزگاری کردی وەکو ئەوەی چۆن پێت ناخۆشە بچیتە جەهەنم. خوای ﷻ تام و چێژ و لەزەتی عیبادەت بە هەمووومان بدات وامان لێ بکات عابد بین و خواپەرست بین.

# خۆشویستنی خوای عَزَّوَجَلَّ بۆ بەندەکانی

چەند کەس تامەزرۆیە خێزانی خۆشی بووێ!؟ چەند کەس تامەزرۆیە سەرۆکەکەی خۆشی بووێ!؟ چەند کەس تامەزرۆیە مامۆستاکەی خۆشی بووێ!؟ ئەڵێ لەوانەیە چەند دەرەجەیەکم بداتێ، چەند کەس تامەزرۆیە وەستاکەی خۆشی بووێ !؟ ئەڵێ لەوانەیە مەعاشەکەم بۆ زیاد بکا یان ئیشێکی ئاسانم بداتە دەست، وە چەند کەسیش تامەزرۆیە اللّٰە عَزَّوَجَلَّ خۆشی بووێ!؟ کامەشی زەروور ترە؟ اللّٰە عَزَّوَجَلَّ خۆشمانی بووێ؟ یان ئەو شتانەی کە باسمان کرد؟ کامەی ئەتوانێ قازانجی زەوی و ئاسمانت پێ بگەینێ سوودی دونیا و ئاخیرەتت پێ بگەینێ جگە لە خوا کێ دەتوانێ؟ لەبەر ئەوە ئینسان ئەبی هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بێ بگاتە ئەو سنورەی کە خوای عَزَّوَجَلَّ خۆشی بووێ.

دوو جۆر خۆشەویستی خوای عَزَّوَجَلَّ هەیە بۆ عەبدەکانی.

*یەکێکیان گشتییە.

*ئەوەی تریان تایبەتیە.

گشتییەکە بۆ هەموو خەڵکییە بۆ هەمووانە بۆ موسڵمان و کافریشە. ئەویش چەند خاڵێك لە خۆی دەگرێت.

**خاڵی یەکەم:** ئەوەیە کە خوای ﷻ بەدەستی خۆی درووستی کردووین ئادەمی بە دەستی خۆی درووست کردوە ئەمە خۆشویستنێەکە بۆ هەموو خەڵکی خوای ﷻ هەیەتی لەبەر ئەوەی اللّٰه یە ﷻ .

**خاڵی دووەم:** بە جوانترین شێوە دروستی کردووین ! سەیری شێوەی ئینسان بکەن وە سەیری شێوەی حەیوان بکە ، بێگومان ئەو شتانە ئەگەر بیری لێ بکەینەوە گەورەترین خۆشەویستی خوای ﷻ دەچێتە دڵمان ! بەڵام موسڵمانی ئەمڕۆ یەك عیبادەت هەیە زۆر زۆر گەورە و گرینگە لە بیریان کردووە ئەویش: بیرکردنەوەیە، بیرکردنەوەیە گەورەترین عیبادەتە بۆ ئەوەی لە خوا نزیکت بکاتەوە، بیر بکەوە خوای گەورە بۆچی تۆی وا درووست کردوە ؟ غەیری تۆی وا درووست کردووە؟ ئەم شتانە زەرووره ، وە ئەو شێوە جوانەی کە خوای گەورە درووستی کردووە بۆچی؟ بۆ ئەوەی خوای ﷻ پێ بناسیتەوە: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١﴾ لە سەیرکردن نەفسی خۆتان خوای ﷻ ئەناسن، خواتان خۆش ئەوێ ئایا سەیری خۆتان ناکەن خوای ﷻ چی درووست کردووە؟.

**خاڵی سێیەم:** خوای ﷻ نەفخی روحی کردۆتە ئینسانە واتا: ئادەم عليه السلام، لە کاتێکیش کە پژمی وتی: الحمدللّٰه خوای گەورە خۆی وەڵامی دایەوە .

**خاڵی چوارەم:** سوجدەی مەلائیکەتەکان بۆ ئادەم عليه السلام، هەر چەندە زانایان ئەفەرموون: ئەمە سوجدەی ڕێزە خۆ ئەگەر غەیری سوجدەی ڕێزەیش بێ مادەم خوا خۆی فەرمانی پێ کردووە هەر سوجدەیەك بی ئیشی ئێمە نیە لێی

بکۆڵینەوە، چونکە خوای ﷻ خۆی ئەمرێ کردووە بە مەلائیکەتەکان و بە ئیبلیس سوجدەی بۆ ببەن . واتا بزانە خوای ﷻ چەنێك تۆی خۆش ئەوێت ! ئەگەر کەسێك ئەوەندە تۆی خۆش بوێ ئەبێ تۆ چەنێك ئەوت خۆش بوێ ؟ بێگومان یەك شتی زۆر گرینگ هەیە هەتا تۆ خوات خۆش نەوێ، خوا تۆی خۆشناوێت .

**خاڵی پێنجەم:** یەکێك لەو نیشانەی کە هەست بکەی خوای ﷻ تۆی خۆش دەوێ ئەویش:عەقلە، عەقل مەناتی تەکلیفە ئەوەی عەقلی نەبێ تەکلیفی شەرعی لەسەر نیە ، ئەو کەسەی کە عەقلی هەبێت بەکاری نەهێنێت دەچێتە جەهەنم، وەک خوای گەورە ﷻ فەرموویەتی:﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾﴾ خەڵك ئەگەر گوێ بگرێ لە دینی خوای ﷻ وە ئەگەر عەقل بەکار بێنێ قەت ناچێتە جەهەننەم ئەمە نەصی ئایەتی خوای ﷻ دەربارەی جەهەنمیەکان بۆمان نەقل ئەکات ئەڵێن: گوێمان نەگرت لە دینی خوا وە ئەقڵمان بە کارنەهێنا بۆ ئەوەی حەق و باتڵ لێك جیا بکەینەوە ، کە ئێستا حەق و باتڵ بە چاو دەزانرێ نەك بە ئایەت و حەدیس !! واتا ئەوەی کە عیلمی پێ بێ زۆر زۆر ڕوونترە لای وەکو کەسێك کە عیلمی پێ نیە، چونکە فەساد دیارە حەق دیارە باتڵیش دیارە کوفر و ئیمانیش دیارە.

**خاڵی شەشەم:** تسخیر! بزانە خوای ﷻ کەسێکی خۆش بوێ کۆمەڵە شتێکی بۆ ئاسان دەکات، ئەو زەویە کێ وای لێ کردووە تۆ بە ئاسانی لەسەری بڕۆی؟ کێ وای لە تۆ کردووە سەیارەت هەبێ؟ کێ وای کردووە هەموو ئەو شتانە وەك

ئاسمان و زەوی و شەو و ڕۆژ و باران هەبێ هەموو ئەمانە لە خزمەتی کێیە؟ بێگومان لە خزمەتی عەبدەکانە.

**خاڵی حەوتەم:** رزق، خوای ﷻ ڕزقی هەموو عەبدەکانی دەدات یەك لە حزە ریزقت لێ بگرێتەوە دەمری ! یەکێك لە ریزقەکانی خوای ﷻ هەناسەیە ! ئەگەر ویستی وابێ لێت بگرێتەوە کە لێیشت ناگرێتەوە، یەکێك لە حیکمەتەکانی بۆ ئەوەی تەوبە بکەیت سەرزەنشتی نەفسی خۆت بکە ئەو نەفسە یەك لە حزەیە خوای ﷻ رای بگری کەست دەست ناکەوێت یارمەتیت بدا.

ئەم خۆشەویستییەی خوای ﷻ عامە، بەڵام ئەو خۆشەویستییەی کە پێویستە گەنج بە دوای بگەڕێ ، وەکو عاشق کە لە دوای مەعشوقەکەی دەگەڕێ ، وەکو خەڵك لە دوای خۆشەویستی پارە دەگەڕێ لە دوای خۆشەویستی سەیارە و لە دوای خۆشەویستی سەرکردەی دەگەڕێ، پێویستە موسڵمان لەدوای خۆشەویستی خوای ﷻ بگەڕێت هەوڵی تەواو بدات بۆ ئەوەی خوای ﷻ سەد لە سەد خۆشتی بوێ، واتا: زۆر زۆر ترسناکە بۆ دین و دونیای سەدا پەنجا و شەست و ئەوەندە خوای گەورە تۆی خۆشبوێ ، چونکە خوای ﷻ بە قەدەر خۆشەویستی بۆت حیفزت دەداتێ ئیمانت دەداتێ قیامەتت دەداتێ حیفزت دەکات چەنێك تۆی خۆش بوێ ، ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ دووبارە نموونەی برادەرایەتی دەهێنمەوە ، تۆ ئەگەر برادەرێکی زۆر نزیکت هەبێ دائیمەن شتێك بکڕی دانەیەك بۆ ئەو دەکڕی ، حەز ئەکەی زۆری شتەکانت بدەتیە ئەو چی باشە بۆ ئەو بێ، چی شتێك خێرە زوو پێی ئەڵێی وەرە من ئەو شتەم کرد تۆش بیکە،

ئەو شتانە هەیە ، ئێستا خوای ﷻ پێغەمبەرانی خۆشویست هەمووی کرد بە پێغەمبەر! بێگومان بۆ ئەوانە بوون بە پێغەمبەر ؟ ئایا خوای ﷻ فەرق و جیاوازی ئەکات لە نێوان ئەوەی کە ئەوان پێغەمبەرن ئێمە پێغەمبەر نین ؟ نا چونکە ئێستا ئێمە خۆمان دەناسین! چەنێك خوامان خۆش ئەوێت ! ئەوانیش چەندە خوایان خۆشویستووە! نوح عليه السلام ٩٥٠ساڵ دەعوە و بانگەوازی کرد. کێ ئەتوانێ ٩٥٠ ڕۆژ بانگخوازی بۆ ئیسلام بکات ؟ کەواتە تۆ ئەو ئەهلە نیت و ئەو خۆشەویستیە تەواوەت بداتێ چونکە ناتەوێ .

با سەیری محمد ﷺ بکەین ٢٣ ساڵ لە برسیتی لە لێدان و لە دەرکردن بەڵام لەززەتی لێ وەرئەگری بۆیە خوای ﷻ ئەو دەکات بە پێغەمبەر چونکە زۆری خۆشی ئەوێ ئەهلە بۆ ئەوەی خۆشی بوێ، ئەو خۆشەویستیە زەرووره کە خۆشەویستی تایبەتی پێ ئەڵێن . واتا خوای ﷻ بە تایبەت تۆی خۆش بوێ . بۆچی خوای ﷻ ڕەخنەی لە پێغەمبەر ﷺ گرت کاتێك کە پشتی لەو صەحابەیە کرد لەبەر قوڕەیش؟

خوای ﷻ ئەفەرمووێ: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢﴾ وتی: چی اللّه ﷻ؟

﴿أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢﴾ ئەو خۆی هات بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا! بەڵام ئەوانی تر پێغەمبەری خوا بانگی کردن ! پەروەردگار پەکی لەبەر ئێمە نەکەوتووە ئەگەر تۆ نەچی بۆ لای خوای ﷻ ، خوا نایات بۆ لای تۆ! چونکە ئیشی پێت نیە! لەبەر ئەوە ئەبێ تۆ هەوڵی ئەوە بدەی کە بگەڕێی.

چۆن بگەم بەو لەززەتە؟ چۆن بگەم بەو خۆشیە ؟ چۆن بگەم بە خۆشەویستی خوای ﷻ بە دانیشتن کەس پێی ناگات چۆن دەگەڕێی لە دوای ئیشێکی ئاسان؟ لە دوای شوێنێکی باش؟ لە دوای شەهادەیەکی باش؟ دەپرسی چی مامۆستایەك باشە؟ دەپرسی چی سەیارەیەك باشە؟ هەمووی مواسەفاتت دەوێ و دەی کامەی زەروور ترە تۆ لێی بپرسی ؟ خۆشەویستی خوا یان ئەو شتە دونیایانە! لەبەر ئەوە زەرووره بۆ موسڵمان ئەو سیفاتەی صەحابەی تیابێت پرسیار بکەن لە دین، بگەڕێ لە دوای دین، بزانە ئەصحابی محمد ﷺ چۆن بووە؟ لە باش لە خراپ . ئەبو زەری غەفاری رضي الله عنه دەفەرمووێت: (كان الناس يسألون رسول اللّٰه ﷺ عن الخير، وكنت أسأله عن الشر مخافة أن يدركني،) خەڵك پرسیاری ئەکرد لە خێر کە زانیم خێر کامەیە، پاشان گوتم با پرسیار بکەم لە شەڕ تا خۆمی لێ بپارێزم!! . تۆ ئەبێ پرسیار بکەی ، بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەجال کە دێ خوای ﷺ لە شەڕی بمانپارێزی فەرمووی ڕۆژی یەکەمی بە قەدەر یەك ساڵە) کام لە ئێمە ئەو قسەیەی بۆ بکەی بیری لای نوێژەکانە ! سەحابەیەك فەرمووی: یا رسول اللّٰه چۆن نوێژ بکەین؟ سەیری اصحابی محمد ﷺ بکەن چەنێك لەگەڵ خوان لەگەڵ خوا پەرستنن. بزانن ڕاست ترین و خۆشەویست ترین عەبد لای خوای ﷻ ئەو عەبدەیە کە خوای ﷻ لە سوڕەتی زمر دەربارەیان دەفەرمووێ: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ١٧ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ﴾ باشترین و ڕاستگۆ ترین عەبد ئەوەیە کە گوێی لە کەلامی اللّٰه ﷻ دەبێ یەکسەر شوێنی دەکەوێ، نەك بەس ئەوەندە (فحسن) بەڵکو بە جوانترین شێوە شوێنی

ئەکەوێ، پاشان ئەو شوێنکەوتنە شوێن کەوتنی اللّٰه و خۆشەویستی اللّٰه بێت، ئەبێ چەنێك ئینسانی موسڵمان هەوڵی بۆ بدا؟.



## نیشانەی خۆشویستنی خوای ﷻ بۆ بەندەکانی

**یەکەم خاڵ:** هەر کەسێك لەسەر زەوی خوای ﷻ خۆشی ویست خوای ﷻ ئەمر دەکات هەموو خەڵکی سەر زەوی خۆشیان بوێ بەتایبەت ئیمانداران ! لە کوێ دەست پێ دەکات ئەو خۆشەویستیە لە ئاسمانەوە . لە حەدیسی قودسیدا هاتووە کە دەفەرمووێ:( خوای ﷻ بانگی جبریل دەکات یا جبریل فڵانە کەسم خۆش ئەوێ تۆش خۆشت بوێ ، دوای دەفەرمووێ : ئەی جبریل بە ئەهلی ئاسمان بڵێ خوای ﷻ ئەو عەبدەی خۆش ئەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئەو جا دێتە سەر زەوی ، ئەی خەڵکی سەر زەوی من فڵانە کەسم خۆش ئەوێ ئێوەیش خۆشتان بوێ) ئینجا سەیرکە دەچیتە دائیرەیەك یەکسەر دڵیان نەرم دەبێ بێ ئەوەی بتناسن یەکسەر قەبوڵت ئەکان. ئەڵێن :واللّٰه هی قەینا دڵمان بۆ تۆ نەرم بووە، دەچیتە لای وەستای تا ئیشت پیبدات ئەڵێ: واللّٰه هی چەند کەسم ڕەت کردۆتەوە بەس تۆ قەبوڵ ئەکەم قەینا، ئەچیتە لای فیتەر ئەڵێ: واللّٰه هی بەوەندە بۆ خەڵکی ئەکەم بەس بۆ تۆ کەمتر دەیکەم ، ئەچیتە لای دکتۆر دەڵێ: دەوام تەواو بووە بەس قەینا تۆ وەرە .

هەر کەسەو بەقەدەر خۆشەویستی خوا بۆ ئەو ئەو شتانەی بۆ ئاسان دەبێ، چەنێك خوای ﷻ لەگەڵت بێ قەبوڵت بکا کەس دڵی نایەت ڕەتت کاتەوە، بە تایبەت ئەو کەسانەی کە تۆیان خۆش ئەوێ ، بزانە ئەگەر ئیماندارێکی زۆر تۆیان خۆشویست بە زۆری ئەوان دەرەجەی ئەوەیە کە خوای ﷻ زۆر تۆی خۆش ئەوێ،

وەکو زانایەك دەفەرمووێ:( هیچ گرینگ نیە تۆ خوای گەورەت خۆش بوێ چونکە تۆ ئیشت بە خوایە خوا ئیشی بە تۆ نیە)، بەس سەیری قسەکردنیان بکە جارێ لەگەڵ خوا بزانە چۆن ناوی خوا دێنن خوا ئەو نەوعە عەبدانەی چۆن خۆشناوێ؟ کێ لە ئێمە تاوەکو ئێستا وا قسەی کردووە لەگەڵ خوای ﷻ ئەفەرمووێ: (مولای) ئەو وشەیە وەکو چۆن ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: واللّٰه هی سوێند دەخوات، سێ جار ئەو کەسەی لە سورەتی فاتیحە کە ئەفەرمووێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ خوای ﷻ ئەفەرمووێ: بەندەکەم سوپاسمی کرد، ئەفەرمووێ: واللّٰه هی هەر کەسێ لە وشەیەی (عبدی) تێ بگات ئیلا باڵی هەبێ دەفڕی لە خۆشیان، خۆشترین وشەیە خوا پێت بڵێ: عەبدی، وە چەند خۆشە تۆ بڵێی سەیدی مەولای !!! بەو شێوە قسە لەگەڵ خوای ﷻ بکەی، بەس ئەمانە ئەو کەسەی خوای ﷻ زۆر خۆشی نەوێ ناتوانێ ئەو وشەیە بەکار بێنێ، ئەگەر بەکاریشی بێنێت ئیلا بە ساردی و بە مردووی بەکاری دەهێنێت. بەس کە ئەو ئەیووت: یا مەولای ، هەرچی خەمی دڵی هەیە ئەڕۆیشت چونکە ئەیزانی لەگەڵ کێ قسەدەکات.

مناڵێك هەبوو باسی دەکەن هەموو جارێ زۆر بە بەتوندی ئەیفەرموو: (خوایە من تۆم خۆش ئەوێ تۆ منت خۆش ئەوێ؟ واتا هیچ گرینگ نیە من تۆم خۆش ئەوێ بەس ئەوە گرینگە کە تۆ منت خۆش بوێ، لەبەر ئەوە ئینسان وابکا لەگەڵ خوا بەو شێوە قسە بکات، ئینجا ئەفەرمووێ: (هیچ سەرسوڕمان نیە عەبدێکی فەقیر خوایەکی دەوڵەمەندی خۆش بوێ، بەڵکو ئەوە جێی سەرسوڕمانە خوایەکی بە هێز عەبدێکی فەقیری خۆش بوێ ) وەك یەحیای کوڕی معاز

تابعییەکی گەورەیە ئەفەرمووێ: (ئیلاهی) سەیری ئەو لەفزانە بزانە صەحابە و تابعین چۆن قسەیان کردووە لەگەڵ خوای ﷻ ، ئێمە دەڵێین: خوایە هەر ئەوەندە بەسادەیی ، بەڵام سەیری ئەو لفزە بکە خوای گەورە الفازی پێ خۆشە لە قورئان وەصفی خۆی دەکات ئەیەوێ وەصفی بکەی وشەی گەورە بۆ خوای ﷻبەکاربێنە .

﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ بۆ نموونە من چوومە دائیرەیەك  بە منیان وتووە: ڕاپۆرتێك بنووسە ڕاپۆڕت دەوری کاریگەری هەیە گەر ڕاپۆرتەکە کەسێکی لێزان نوسیبێتی یەکسەر قەبوڵیان کردووە واتا تۆ بزانە تۆ چۆن داوا لە خوا دەکەی؟ چۆن قسە لەگەڵ خوا دەکەی؟  چۆن ناوی دەهێنیت؟ ئینجا ئەفەرمووێ:(خوایە هیچ هونەرێکی تیا نیە سەرسورمان نیە ئەگەر  عەبدێکی زەلیلی وەکو من خوایەکی جەلیلی وەکو تۆ خۆش بوێ . (جلیل واتا الجمال الزخم )، واتا جوانیەکی گەورە ، گەورەی بەتوانا کە خوایە ﷻ. ئینجا ئەفەرمووێ: (بەڵام خوایەکی گەورە عەبدێکی زەلیلی خۆش بوێ) .

وە مامۆستای خۆشەویستم ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ  ئەفەرموێت :( سەرسورمان نیە لەوەی عەبدەکانی خوای ﷻ خوایان خۆش ئەوێ، بەڵام خۆشیەکەی ئەوەیە کە خوای ﷻ تۆی خۆش بوێ، هیچی تیا نیە عەبدێکی فەقیر چاکەکارێکی خۆش بوێ کە اللّٰه یە، بەڵام ئەوەیە کە خوای ﷻ عەبدێکی فەقیری خۆش بوێ کە خۆی موحسینە) بۆیە هیچی تیا نیە چونکە خوای گەورە مەنانە واتا خوای گەورە منەتی بە کەس نیە خۆشی بوێ و خۆشی نەوێ ئەو هەر خوایە ، بەڵام ئەگەر خوا تۆی خۆشنەوێ ! تۆ خەسارەتمەندی دونیا و ئاخیرەتی تۆ فەقیری

تۆ نەخۆشی تۆ مردووی تۆ برسی تۆ نەزانی تۆ بێکەسی !!! ئەگەر خوا خۆشتی نەوێ تۆ دۆڕاوی؟ تۆ ئەهلی ئاگری ! ئەوانە هەموو سیفەتی ئەو کەسانەیە کە خوا خۆشی نەوێ.

بەڵام ئەگەر خوای ﷻ خۆشی ویستی ئەوە تۆ هەموو شتێکی، تۆ سەرکەوتووی، تۆ دەوڵەمەندی، تۆ ساحێبی شەهادەیت، بەڕاستی تۆ دکتۆری، تۆ موهەندیسی، تۆ جوانی هەموو سیفاتێك بۆ تۆیە چونکە خوای ﷻ تۆی خۆشویست، خەڵك موعجیبە وەکو سەحیرەکانی فیرعەون، وتیان: ئەی فیرعەون ئەگەر زاڵبین بەسەر موسا چیمان بۆ هەیە؟ ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرۡعَوۡنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ٤١ قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ٤٢﴾ ئێوە لە نزیکی منن! جا چ نزیکیەك لەوە خۆشترە کە لە خوا نزیك بی! وە هیچ کەسێکیش لە خوا نزیك نابێتەوە هەتا خوای ﷻ خۆشی نەوێت !.

لەبەر ئەوە ئینسان موعجیب نەبێ بەوەی کەوا خوای ﷻ خۆش ویست ، نا بەڵکو ئەوە گرینگە کە خوای ﷻ ئێمەی خۆش بوێ، هەموو شتێك لە دین بەڵگەی هەیە ، خوای ﷻ عەبدێکی خۆش بوێ بە خەڵکی سەر زەوی دەفەمووێ: خەڵکینە من فڵانە کەسم خۆش ویست خۆشتان بوێ، واتا: هەموو کەس قەبوڵت دەکات، لە ماڵەوە دایك و باوکت تۆی لە هەمووان خۆشتر دەوێ، لە مەکتەب مامۆستا تۆی لە هەموو کەس خۆشتری دەوێت، وەستاکەت تۆی لە هەمووان خۆشتر دەوێت، بڕۆ هەموو شوێنێك یەکسەر هەست دەکەی خەڵك تۆی خۆش ئەوێ، جاری وا هەیە دوژمنەکەتیش تۆی خۆش ئەوێ، تۆ هەوڵ بدەی بگەی بە

خۆشەویستی خوای ﷻ بۆ ئەوەی خوای ﷻ ئەو فەزڵانەی کە داویەتی بیدا بە تۆیش .

**خاڵی دووەم:** خاڵێکی تر کە زۆر زۆر زەرووورو کە خوای ﷻ بیدا بە عەبدەکانی کە عامی خەڵك ڕەتی دەکاتەوە ئەویش: تاقیکردنەوەیە ، خوای ﷻ ئەگەر کەسێکی خۆش بوێت تاقی دەکاتەوە ، چەند کەس خوا تاقیکردۆتەوە پێی ناخۆشە ، واتا: خوایە من پێم ناخۆشە تۆ منت خۆشبوێ !!! خۆشەویستیەك بەوەی بێ کە منداڵم لێ بمرێنیت، فەقیرم بکەی، ناجیحم نەکەی لە مەکتەب، شەهادەیەکی گەورەم پێ نەدەی، من جوان نەبم، من کوڕی فڵانە کەس نەبم، ئەو خۆشەویستیەم ناوێ !!! ئەوە ماناکەیەتی ! بەڵام صەحابەی محمد ﷺ وابوونە لە فەقیری لە ناخۆشی لە نەخۆشی ڕەخنەیان گرتبێ؟ بەڵام دەبینین لەو پەڕی خۆشەویستی خوای ﷻ بوونە ، هەروەك یەکێك لە تابیعین لە بن دیوارێك بوو منداڵان وایان زانی شێتە لێیان دا وتی: یا سەیدی ئەی سەیدەکەم ئەی خوایە کەم ( واللّٰه هی ئەگەر بە مشار بمبڕنەوە بە مشار پارچە پارچەم بکەن هیچ شتێك لە دڵیمن زیاد ناکات بەرامبەر تۆ ئیلا خۆشەویستی نەبێ !!!) لەکاتێکدا کە زۆر لێ دەدەن ، چونکە ئەوان دەیانزانی خۆشەویستی لەگەڵ خوای گەورە چی بوو. خوای ﷻ ئەوەی کە بەسەری دەهێنێ، ئەو پەڕی خۆشەویستی خوا بۆ ئینسان ئەوەیە کە تاقی بکاتەوە ، پرسیاریان کرد یارسول اللّٰه (سئل رسول اللّٰه أي الناس أشد بلاء) کێ لە هەموو کەس زیاتر تووشی تاقیکردنەوە دێ ؟ (قال الأنبياء) کێ هەیە لەسەر زەوی لە محمد ﷺخۆشەویست تر بێ لە لای خوا ؟ کێ هەیە لە

پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر تاقیکردنەوەی پێ درابی؟ ئەفەرمووێ: (ما أوذي نبي مثلما أوذيت) هیچ پێغەمبەرێك بەقەدەر من ئەزیەتی نەخواردووە لە برسیتی لە دەرکردن لە بێکەسی لە هەتیوی، بە فەقیری گەورە بووە بە هەتیوی لە ناو سکی دایکیتی باوکی ئەمرێ، لە شەش ساڵیدا دایکی ئەمرێ ، ئینجا بڕۆ لای باپیری لای مامی هەر بە فەقیری و بە شوانی ، بەڵام پلە و پایەی محمد ﷺ چەندێکە لای خوای ﷻ؟ هەتا خوای ﷻ چوار جار ناوی هێناوە لە قورئان هەموو پێغەمبەرەکانیش بە ناوی خۆیان دەهێنێ تەنها محمد ﷺ ، ئەوەندەی خۆش ئەوێ ئەگەر ناویشی بێنی بەتەنیا ناوی نەهێناوە ،کاتێك دەفەرمووێت: موسا چەندیش خۆش ئەوێ دەفەرمووێ: موسا عیسا نوح بەڵام کە ئەفەرمووێت: (محمد رسول اللّٰه ﷺ) ئیلا شتێك لەگەڵی دەڵێت قەت بەتەنیا ناڵێ چونکە زۆری خۆش ئەوی ﷺ، واللّٰه هی هەر کەسێکیش خوا خۆشی بوێ وای لێ ئەکا، وا ناوی دەهێنی بە ناوی خۆش بە شتی خۆش، وە ئەو کەسانەشی کە خوایان خۆش ئەوێ هەستی پێ ئەکەن، خوای گەورە ئەو هەستەشی ئەداتێ کە هەست بکا کەوا خوا خۆشی ئەوێ بۆ ئەوەی لەززەتی لێبکا بۆ ئەوەی هیچ خۆشەویستیەکی تر نەچێتە دڵی ، لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان ئەوە بزانێ کە چەنێك خوای گەورە تاقیکردەوە ئەوەندە تۆی خۆش ئەوێ.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (إن عظم الجزاء مع عظم البلاء) گەورەی ئەجر و گەورەیی خۆشەویستی من لەگەڵ گەورەیی تاقیکرنەوەیە ، چەنێك خوای گەورە تاقیت بکاتەوە تاقیکردنەوەکەت گەورە بێ ئەوە ئەوەندە خوای گەورە تۆی خۆش ئەوێ . ئینجا ئەفەرمووێ: (وإن اللَّه ﷻ إذا أحب قوما ابتلاهم)خوا ئەگەر

قەومێکی خۆشویست تاقی ئەکاتەوە ! واللّٰه هی ئەگەر بەس لەو نوقتەیە بیر بکەیتەوە لە خۆشیا دەگری ،
بۆیە سەلەف کاتێك کە توشی تاقیکردنەوە دەبوون شوکری خوایان دەکرد، تاقیکردنەوە سێ حالەتە ( یان ئەوەیە سەبر دەکەی، یان ئەوەیە ڕازی پێی، یان ئەوەیە شوکری لەسەر دەکەی ) گەورەترین دەرەجەیش ئەو کەسانەیە کە خوایان زۆر خۆش ئەوێ کە شوکرە واتا زۆر کەس هەیە ئیمانی هەیە سەبر ئەکا لەسەر موسیبەت بەڵام خوای گەورە خۆشتری دەوێت ئەویش چیە ؟ ئەوەیە کە ڕازیبی بەوە (اللهم إني أسألك الرضا بعد القضاء، وبرد العيش بعد الموت) ئەوە لە دوعاکانی پێغەمبەرە ﷺ خوایە ڕازیم بەو قەدەرەی کە تۆ بەسەرم دەهێنی بە هەموو بەشەکانی .

گەورەترین دەرەجەیش کە زۆر گرینگە ئەویش شوکرە لەسەر ناخۆشی ، واتا کاتێك کەخوا فەقیری دەکات شوکری خوا بکا، کاتێك کە خوای ﷻ نەخۆشی ئەکات شوکری خوا دەکا، کاتێك کە خوای ﷻ منداڵێکی لێ ئەمرێنێ شوکری خوا ئەکا، چی شتێك خوای ﷻ لە تۆی گرتەوە نیشانەی خۆشەویستی خوای ﷻ بۆ ئەو کەسە، ئینجا ئەفەرمووێ: (فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط) هەر کەسێك ڕازی بێ بەوەی خوای ﷻ تاقی بکاتەوە خوای گەورە لێی ڕازی یە و خۆشی دەوێ ، ئەگەر کەسێکیش ڕازی نەبێ بەوەی کە خوای ﷻ تاقی بکاتەوە خوای گەورە پەنامان بدا خوای ﷻ لێی ڕازی نیە.

ئیمامی مەناوی ئەفەرمووێ: لە شەرعی ئەو حەدیسە (وإن الله ﷻ إذا أحب قوما ابتلاهم) أي اختبرهم بالمحن والرزايا وهو أعلم بحالهم) خوای گەورە تاقیت دەکاتەوە عەلمیشە بە تۆ چەنێك سەبر دەکەی چەنێك پێت خۆشە خوای ﷻ تاقیت بکاتەوە، بێگومان یەکێك لەو خاڵانەی کەوا لە تاقیکردنەوەی خۆت ڕازی دەبی ئەوەش ئەو دوعایەیە کە زۆر بیکەین (اللهم إني أسألك حبك، وحب من يحبك، والعمل الذي يبلغني حبك، اللهم اجعل حبك أحب إلي من نفسي، وأهلي، ومن الماء البارد) خوایە تۆ بەسەرم دەهێنی خۆشەویستی بخە دڵم بتوانم شوکری تاقیك ردنەوە بکەم بتوانم بە نیعمەت لە قەلەمی بدەم نەك بە ناخۆشی و نەخۆشی ، ئینجا لوقمانی حەکیم ئەفەرمووێ: (قال لقمان لابنه يا بني الذهب والفضة يختبران بالنار والمؤمن يختبر بالبلاء) ئەی کوڕی خۆم زێڕ و زیو بە ئاگر تەسفیە دەکرێ هەتا لە ئاگر نەدرێ خڵتەکەی لاناچی ، وە ئیمانداریش بە موسیبەت و بە تاقیکردنەوە خوای گەورە پاکی ئەکاتەوە ، وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤١﴾.

تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی خوای گەورە سەفی موسڵمانان کێ پاکە پاکەکان جیا بکاتەوە ئەوانەشی کە بەس بە شکل ئیماندان بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە ئەو کەسە وانیە کە لێی تێگەیشتوون، ئەمە یەکێك لە مەبەستی تاقیکردنەوە.

ئینجا هەر کەسێك ڕازیبێ بەوە خوای گەورە لێی ڕازی دەبێ خۆشەویستی خۆی پێ ئەدا وە هەر کەسێکیش پێی ناخۆشبێ خوای گەورە تاقی بکاتەوە ئەوە خۆشەویستی خۆی لێ ئەسێنیتەوە و لێشی تورە دەبێ، ئینجا ئەفەرمووێ:

ڕەحمەتی خوای لێ بێ ( مەحاله کەسێکیش ڕازیبی بە قەزای خوا ئیلا دوای ئەوەی
کەوا خوا ڕازیە لەو عەبدە بەبەڵگەی ئەم ئایەتەی ﴿رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ﴾

**خاڵی سێیەم:** خاڵێکی تر کە بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی خوای ﷻ، خوای پەروەردگار ئەگەر کەسێکی خۆشبوێ هەر لە منداڵی ناهێڵێت تووشی غەڵەت بێ، سەیری پێغەمبەران بکە هیچ یەکێکیان تووشی غەڵەت نەبووە ! پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ: شوان بووم خەریك بوو بچم بۆ شوێنێك گوێم لە دەنگێك بوو ویستم بڕۆم بۆ لای ئەو دەنگە بەڵام لە ڕێگا خەوم لێ کەوت ، هەتا وەکو گەرما لەسەری دام بەخەبەر هاتم . موسا عليه السلام فڕێیاندایە ناو بەحر لەکاتێکدا کە منداڵە، چەند کەس لە ئێمە چووەتە لای بەحر کە بەو هێزەی خۆی وتیانە بڕۆ ناو ئاو دەڵێ مەلەوانی نازانم دەخنکێم ، کێ موسای پاراست لە بەحر منداڵێك خۆ مەلەوانی نازانی ، لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەیزانی موسا پیاوە ئەیزانی موسا ئەهلە بۆ ئەوەی الله ی خۆش بوێ بۆیە هەر لە دونیا موسا ئەوەندەی خوای خۆش ئەویست داوای کرد یارەب خۆتم پێ نیشان بدە ، هەر لە دونیا خۆی پێ ڕانەگیرا، تەحەمولی نەکرد بمرێ و خوا ببینێ، چونکە ئەوەی حەزی بەو لیقایە نەبێ تام لە هیچ شتێك ناکات ، بەڵام خوای گەورە ویستی وایە لە دونیا نەبینرێت هەتا وەکو لە قیامەت نەبێ یارەبی خوای گەورە خۆتمان پێ نیشان بدەی.

با سەیری پێغەمبەرەکانی تری خوای ﷻ بکەین هەر لە بچووکی ئەیان پارێزێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو سکی دایکیەتی باوکی ئەمرێ لە شەش ساڵی دایکی ئەمرێت واتا هەر بچووکە بەڵام گەورەی کرد بە خێوی کرد ناویشی گەورە کرد

کردیشی بە پێغەمبەر وە ئەو پیاوە بەڕێزەیە هەتا قیامەتیش ناوی دەهێنرێت ئیمامی هەموو خەڵکی سەر زەویە، گەورەترین بەشەرە ، کەسێك نیە لای خوا لەو بە تەقوا تر و خۆشەویست تر و بەڕێزتر تر بێ لە پێغەمبەری ﷺ کە خوا ئەو فەزڵەی بە ئێمە دا ئێمە ئومەتی موحەممەدین ﷺ ، لەبەر ئەوە ئەو خاڵە زۆر زۆر زەرووورە ئینسانی موسڵمان کەوا خوای پەروەردگار هەر لە بچووکیەوە بتپارێزی بۆ دینەکەت ، عیسا عليه السلام کاتێك لەگەڵ دایکی بەبێ باوك کە لە دایك بوو خوای گەورە یەکسەر بۆ ئەوەی بە ڕاستگۆ لە ناو خەڵك بڵاوی بکاتەوە دایکی وتی: قسە بکەن لە گەڵ عیسایە ﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾﴾ لەکاتی بچووکیدا قسە دەکات لەگەڵ خەڵك لەناو پێشکەدا من پێغەمبەرم من ڕاستگۆم خوای گەورە کتاب و حیکمەتی پێ داوم لە کاتێکدا لەناو پێشکەدایە، بۆیە ئەو کەسەی خوای عز وجل خۆشی بوێ هەر لە بچوکیەوە (مهیدی) دەکات بۆ دینەکەی، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێکی خۆشویست وەکو لە حەدیسی أبی أومامە رضي الله عنه هاتووە (إذا أراد اللّٰه بعبد خيرا طهره قبل موته) هەر کەسێك خوای گەورە ویستی وا بێ شتێکی بۆ بکا ئەوا پاکی ئەکاتەوە پێش ئەوەی بمرێ .

**خاڵی چوارەم:** نهێنی خۆشەویستی خوایە بۆ عەبدەکانی ئەویش: عاقیبەت خێریە، (حسن الخاتمە) یە خوای عز وجل هەر کەسێکی خۆش بوێ عاقیبەتی خێر ئەکا ئەگەر دەرەجەی خۆش ویستنت لای ئەو زیاتر بێ گەورەترین عاقیبەتت دەداتێ کە شەهید بوونە لە پێناوی خوای عز وجل ئەوانەی کە شەهید دەبن گەورەترین

خۆشەویستیان هەیە لەلای خوای ﷻ هیچ کەسێك لە شەهید گەورەتر نیە لە زەوی و لە ئاسمان، واتا بڕۆ لە ماڵ بیست و چوار سەعات نوێژ بکە شەونوێژ بکە بە ڕۆژوو بە ناگەیتە خەوی موجاهیدیش، لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەو کەسەی زۆر زۆر خۆش نەویێ ڕێزی تایبەتی نەبێ ئەو پلەیەی ناداتێ کە پلەی جیهاد و شەهیدیە لە پێناو خوای پەروەردگار. دوایی ئەمە چییە ؟ خوای گەورە لە عەمرە ڕۆحت دەر بکات ، لە سوجدە ڕۆحت دەر بکات، لەسەر قورئان بتباتەوە ئەمانە هەمووی نیشانەی حسن الخاتیمەن.

یان ئەوەی کابرا وتار ئەدا ، وەکو لە ڤیدۆیەکدا بڵاو بوەتەوە، پیرێکە وتار دەدات لە کاتی وتاردانا خوای گەورە روحی ئەکێشی، خەڵکانێکیش هەیە لەناو ئاودەسدا خوای گەورە روحی کێشاوە یەکێك لە سەرکردە تاغوتەکان .

ئەمە هەمووی نیشانەی خۆشەویستی خوای پەروەردگارە بۆ عەبدەکانی ، خوای گەورە ئەگەر کەسێکی خۆش بوێ لە خۆشترین شوێندا روحی ئەکێشی لە خۆشەویست ترین عیبادەتتدا روحی ئەکێشی.

وتمان: هەر کەسێك ئەگەر نەگاتە ئەو پلەیە و ئەو دەرەجەیە و ئەو نیعمەتەی کە لەززەتی عیبادەتە بە تەئکید بەردەوام نابێ لە سەر عیبادەت، بۆیە ئەبینی خەڵك بەس جومعە خوا ئەپەرستی بەس ڕەمەزانان خوا دەپەرستی بۆ؟ چونکە لەززەتی لێ ناکات، بەڵام ئەوانەی کەوا خوا ئەپەرستن و تام و لەززەتی عیبادەت وەرئەگرن وەکو صەحابە تەمەنیان حەفتا و هەشتا و سەد ساڵ بووە صەحابەیك نیە یەك ڕۆژ کەوا تەمەڵی کردبێ لە پەرستنی خوای ﷻ. شتی وا نیە چونکە ئەوان تام و چێژیان ئەکرد لە عیبادەتتی خوای پەروەردگار، جا یەکێك لەو خاڵانەی کە

گەورەترین هۆکارە بۆ ئەوەی خۆشەویستن و تام و چێژی ئیمان و لەززەتی ئیمان بچێتە دڵمان خۆشەویستی خوای پەروەردگارە ﷻ، وە ئینسان بەتەنها دابنیشێ لە ماڵ بە تەنیا خۆشەویستی خوا قیاس بکات لەگەڵ خۆشەویستی غەیری خوای گەورە بزانە کامەی لەززەتی زیاترە ؟ وە ئەوەشی کەوای لە ئێمە کردووە لە خوا دووربین خۆشەویستی غەیری خوای پەروەردگارە ﷻ، هەر لە دایك دەست پێ بکە لە باوك دەست پێ بکە وە لە خوشك لە برا لە خێزانت بەتایبەت ئینجا لە منداڵت لە پارە ئینجا لە شەهادەکەت لە سەیارەکەت ئینجا لە حیزبەکەت ئینجا لە سەرکردەکەت ئینجا وەرە سەر نەفسی خۆشت ئەگەر خوای گەورە قبوڵی ئیمان نەکات، ئیمامی عمر ؓ فەرمووی یا رسول اللّٰه تۆم لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ بەس لە نەفسم نەبێ ، خوای گەورە قبوڵی ئیمانێکی نیە ئەگەر نەفسی خۆمان لە محمد خۆشتر بوێ، بەو ئیمانە ڕووتەی نەفسی خۆمان لە خوا خۆشتر بوێ دایکمان لە خوا خۆشتر بوێ باوکمان لە خوا خۆشتر بوێ شەهادەکەم لە خوا خۆشتر بوێ سەرکردەکەم لە خوا خۆشتر بوێ حزبە گومرایەکەم لە خوا خۆشتر بوێ !!! ئەمە بە تەئکید پێی ئەوترێ درۆ لەگەڵ خوای ﷻ، شیخ الاسلام ابن التیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (خۆشەویستی خوا و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەصلی ئیمانن ) واتا هەر کەسێك خۆشەویستی خوا لە دڵی نەبێ ئیمانی نیە، ئەبێ خۆشەویستی خوای ﷻ لە دڵمان لە هەموو خۆشەویستیەکان زیاتر بێ . چونکە ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (دڵ کە خوای گەورە درووستی کردووە بەس خۆشەویستی خوا قبوڵ ئەکا) وەکو ابن التیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (دڵ خوای گەورە بۆیە درووستی

کردووە چونکە شوێنی خۆشەویستی خوایە)، دوو مەخلوق هەیە زۆر خۆشەویستە لای خوای گەورە.

مەخلوقی یەکەم- عەرشی خوای گەورەیە ئەزانن بۆ عەرش لە هەموو مەخلوقاتەکان گەورەترە؟ هەرچی زەوی و ئاسمان هەیە بە کورسیش لە چاو عەرشی خوای گەورە وەکو گوستیلەیەکە لە سەحرایەك ، لەبەر ئەوەی عەرش شوێنی خوای ﷻ خۆی لەسەر عەرشە.

مەخلوقی دووەم- کە دڵە ؟ بۆچی دڵ لە هەموو لاشە پیرۆز ترە ؟ چونکە دڵ شوێنی خۆشەویستی خوای ﷻ.

بۆیە شەیتان کە هجوم ئەکات (الشيطان جاثم على قلب ابن آدم ، فإذا ذكر اللّٰه خنس ، وإذا غفل وسوس) دێ لەسەر دڵت دا ئەنیشێ مەقەر قیادە، گەر قیادە گیرا جوندی مەعنەویاتی دائەبەزی، لەبەر ئەوە ئیشی شەیتان هجومە بۆ مەقەری قیادە بۆ رەئس کە ئەوی گرت ئەوی تر ئاسان ئەبی جوندیکە تەسلیم دەبی ، بۆیە ئینسانی موسڵمان ئەوە بزانی ئەسڵی هەموو عیبادەتێك لە مەحەبەتی خوا دەست پێ دەکا ، ئەوانەشی کە خۆشەویستی خوای گەورە لە دڵیانە سەیریان بکە کە زیاتر عابیدن لە هەموو کەس زیاتر لە خوا ئەترسن ، لە هەموو کەس لە خوا نزیکترن چونکە خۆشەویستی خوا لە دڵیاندا تێکەڵ بووە، خۆشویستنی هەر کەسێك لە دڵتا بێ تۆ دائیمەن لە خزمەتیدایت، وەک فەیسبوك کە ئێستا زۆر مەشهورە بەسەعات و بە دوو و بە دە لێی بێزار نابێ بۆ؟ چونکە خۆشی ئەوێ لەززەتی لێ ئەکا.

وەرە سەر تۆپی پێ دوو سەعات لە دیاری دائەنیشی وەک واییە دوو دەقەیە کە تەواو بێت، کەسێك خۆشەویستی اللّٰه لە دڵی بێ !! باشە ئەگەر لە رکەعەتێکدا بەقەڕە بخوێنێ دڵی دێ سەلام بداتەوە ؟ ئەگەر بەڕۆژوو بێ ساڵ دوانزەی مانگ دڵی دێ فتار بکاتەوە ؟ ئەگەریش کاتی شەو هات سێ یەکی کۆتایی شەو خوای ﷻ دێتە ئاسمانی یەکەم دڵی دێ بخەوێ خوای ﷻ لە ئاسمانی یەکەمە ئەویش خەوتبێ! مەحاڵە بەڵام ئێمە بۆچی ناتوانین ئەو شتانە بکەین؟ چونکە خۆشەویستی خوای ﷻ لە دڵەکانمان کەمە.

جا ابن التيميه ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەفەرمووێ: ( گەورەترین قەواعید و بنچینەی دین و عیبادەتتی خوای ﷻ خۆشەویستیە وە لە گەورەترین عیبادەتتەکانی دڵیش خۆشەویستی خوای ﷻ نابێ ئەو دڵە غەیری خۆشەویستی خوای ﷻ تیابێ، ئینجا ئەفەرمووێ: هەرچی کردەوە هەیە لە باش لە خراپ سەبەبەکەی خۆش ویستنە، واتا هەر کەسێکتان بینی زۆر زۆر باشەی کرد ئەوە ئیلا خوای ﷻ خۆش، وە هەر کەسێکیشتان بینی خراپە دەکا بزانە ئەو کەسەی کە خراپەی بۆ ئەکا زۆری خۆشی ئەوێ .

وە مامۆستای خۆشەویست ابن القيم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (وهل المنزلة التي فيها تنافس المتنافسون) مەنزیلە وپلە وپایەی خۆشەویستی ئەو پلەیەیەکە خەڵك مونافەسە دەکات لە پێناوی پلە و پایە منافەسە دەکات لە پێناوی ئەو شەهادە، منافەسە دەکات لە پێناوی ئەوەی کێ سەیارەی جوانتر هەبێ قەسری جوانتر هەبێ ئەو شتە تروهاتانەی کە لە شەرع پێی ئەوترێ (تروهات ) تروهات لە زمانی عەرەبیدا واتا: ( لا فائدە فيها ) سوودی نیە ئەگەر لە

خوا نزیکت نەکاتەوە ، بەڵام ئەوانەی تر کە تێگەیشتوونە و علمیان بە خوا هەیە منافەسە دەکەن لەسەر خۆشەویستی خوا ، تابعی وا هەبووە صەحابەی وا هەبووە ئەگەر لە مزگەوت کەسێکی ببینیایە عیبادەتی لەو زیاتر دەکات شەو دەچووە ماڵ و قسەی لەگەڵ نەفسی خۆی دەکرد، فڵانەکەس خوای لە تۆ خۆشتر دەوێ ئەمڕۆ بیینم سونەتێکی لە من زیاتر کرد، ئەوان منافەسەیان بوو لەسەر قیامەت و لەسەر خۆشەویستی خوا .

ئینجا ئەفەرمووێ: : (وإليها شخص العاملون وإلى علمها شمر السابقون، وعليها تفاني المحبون وبروح نسيمها تروَّح العابدون فهي قوت القلوب وغذاء) وە بەرەو گەیشتن بەو پلە بەرزەی ئەو کەسانەی کە مسابەقە دەکەن دەست و باڵی خۆیان هەڵکردووە بۆ لای خوای ﷻ بەهۆی ئەو خۆشویستنەوەیە ، وە خواردنی دڵە، هەر دڵێك هەر ڕوحێك ئەگەر ئەو خۆشەویستیەی تیا نەبێت، وەکو ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێت:(ئەمە جەسەدێکی مردووە و لاشەیەکە روحی تیا نیە) چونکە روحی ئینسان ئەو روحە نیە کە خوای گەورە دەری ئەکا، روحی ئینسان ئەوەیە کە لە دڵتە ئەویش خۆشەویستی خوایە، خەڵك وا تێگەیشتووە ژیان ئەوەیە کە پارەت هەبێ مەعاشی باشت هەبێ بۆ ئەوەی پێی بژی ، بەڵام ژیان لای سەلەفی صالح ژیانی دڵ بووە، بۆیە دەفەرموون: سەرمان دەسورمێ لە کەسانێك کە دەگرین بۆ کەسێك کە لاشەی مردووە، ناگرین بۆ کەسێك کە دڵی مردووە، کە لە ئیسلامیشدا تەعزیە دابنرێ ئەبێ بۆ دڵ دابنرێ !! نەك بۆ لاشە. چونکە لاشەی هەموو کەس دەمرێ بەس دڵ نامرێ !! بۆیە حەیفە ئینسان بهێڵێت کە دڵی بمرێت کە شوێنی خوای گەورەیە ، ئەمە غەڵەتێك و

گوناهێکی گەورەیە بۆ ئەو ئینسانە ، پێویستە ئینسانی موسڵمان خۆی لەو شتانە بپارێزی .

امام ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێ لە شعرێکدا ئەفەرمووێت:

شـــرط المحبــة أن توافق من حب على محبته بلا عصـــيان

واتە: مەرجی خۆشویستنی تۆ بۆ خوای ﷻ ئەوەیە کە تۆ موافەقەی خوا بکەی لە هەموو شتێکدا ئەگەر نەفست پێی ناخۆش بی ئەگەر دایکت ئەگەر باوکت ئەگەر حیزبەکەت ئەگەر دەرکرای لەسەر ئیشەکەت ئەگەر دەرکرای لە شوێنت ئەگەر لێتدرا گرینگ ئەوەیە ئەو شتەی کە تۆ دەیکەی موافقی خوای ﷻ بێ، وە نیشانەی خۆشەویستی خوا ئەوەیە کە تۆ مەعصیەتی خوا نەکەی.

ئینجا ئەفەرمووێ:

فإذا ادعيت له المحبة مع خلا فك ما يحب فأنت ذو بهتان

واتە: ئەگەر ووتت خوایە تۆم خۆش ئەوێ بەڵام خیلافی خوات کرد تۆ بوهتانت کردووە، بوهتانت کردووە کە لەوەی خوای گەورەت خۆش ئەوێ.

پاشان ئەفەرمووێ:

أتحـب أعـداء الحبيـب وتـدعي حبـا لـه مـا ذاك في إمكـان

واتە: بانگەشەی ئەوە دەکەی کە خۆشەویستێکت خۆش ئەوێ بەڵام دەچی دوژمنی ئەو خۆشەویستەت خۆش ئەوێ! ئەچی صەوت دەدەیت بە دوژمنی خۆشەویستەکەت! ئەچی پشتگیری ئەو کەسانە ئەکەی کە دینی خوا دەگۆڕن کە قسە بە خوا دەڵێن، ئەمە شتێکە کە قبوڵ نیە .

ئینجا ئەفەرمووێ:

وكـذا تعـادي جـاهـدا أحبـابـه      أين المحبة يا أخا الشيطان

واتە: ئەچی کێ عەبدی خوایە کێ وەلی خوایە دەچی دژایەتی دەکەیت دەچی جاسووسی لەسەر دەکەیت دەچی تەقریرێکی لە سەر دەنووسی ، چونکە عەبدی خوایە چونکە وەلی خوایە چونکە ڕاستگۆیە .

هەتا بەیانی بڵێی من خوام خۆش ئەوێ ڕاست ئەکات بەس خوایەکەی خۆی خۆش ئەوێ نەك خوای ئێمە !! ، خوای پارەکەی، خوای سەرکردەکەی، خوای حیزبەکەی ئەو خوایە باتڵانەی کە هەیە خۆش ئەوێت. ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەفەرمووێ: (لیس العبادة غیر توحید المحبة مع خضوع القلب والأركـان) عیبادەتت تەنها یەکتاپەرستی خوای گەورەیە لە خۆشەویستندا لەگەڵ ئەوەی کە ملکەچ بی بە دڵ و بە لاشە بۆ خوای عزوجل.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ هیچ کەسێك نیە لە خوای گەورە بچێ لە ناو و لە صیفاتی وە سەمیعە و بە صیرە ، ابن القیم ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئینجا ئەفەرمووێ: ناو و صیفاتی کەس نیە لە خوا بچێ. هیچ خۆشەویستیەك نیە خۆشەویستی لە غەیری خوا بچێ ئەوی تر خۆشەویستی عەزابی پێ ئەڵێن ، کابرا عاشقە بەڵام کە مەعشوقەکەی تەلەفۆنی لەسەر داخست، دڵی خەفەت بار دەبێ خەوی لێ ناکەوێ، چاوەڕێ ئەکا دەبێ وەڵامم بداتەوە، بەڵام خۆشەویستی خوا وانیە هەر چەندە لە زاتی خوا نزیك بیەوە ئەوەندە تۆ مورتاح دەبی ئەوەندە موتمەئین دەبی ،

هەتا دەگەیە ئاخیر پلە کە سەکینەیە ، واتا سەکینە داخڵی هەر دڵێك بوو قەت چاوەڕێی خۆشی و نەخۆشی و دڵتەنگی ناکا ، ئەمەش کەسێك دەستی دەکەوێ اللّٰه ﷻ ی لە هەموو کەسێك خۆشتر بوێ ، بۆیە ئینسانی موسڵمان ئاگای لەوە بی کەوا خۆشویستنی خوای ﷻ لە گەورەترین ئەو ئەسبابانەیە کەوا ئینسان بەرەو زاتی خوای پەروەردگار دەبات.



## هەر کەسێك بیەوێت بزانێت چەند خوای ﷻ خۆش ئەوێ

**خاڵی یەکەم:** یەکەم نیشانەی خۆشویستنی خوای ﷻ ئەوەیە کەوا تۆ موستەقیم بی!! با نموونەیەک بهێنینەوە﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ (ئەگەر برادەرەکەت وازت لێ بهێنێ دوای ماوەیەك پێی ئەڵێی چی؟ ناڵێیت بێ وەفا بوو!!) ئەو کەسەی کە واز لە خوای ﷻبهێنێ بێ وەفایە بەرامبەر بە خوا، ئەگەر برادەرێك برادەرەکەی جێبێڵێ پێی دەڵێی بێ وەفا، ئەو عەبدەی کە هەموو ژیانی بە دەست خوایە هەموو چاکە و هەرچی هەیە بەدەست ئەوە لەش ساغی و هەموو شتێك بە ئەمرێ خوایە بە ویستی خوایە لە چاکەی خوایە ، ئەمە واز لە خوا بهێنێ چی پێ ئەڵێن ؟بێ وەفایی لەگەڵ خوا وە ڕاستی نەکردن لە گەڵ خوای ﷻ.

لەبەر خاڵی یەکەم کە تۆ دڵنیابی لەوەی خوای ﷻ خۆش ئەوێ ڕەمەزان پەرست نەبی! چونکە (من کان یعبد رمضان فإن رمضان قد انقضی، ومن کان یعبد اللّٰه فإن اللّٰه حي لا یموت" أو "کن ربانیاً ولا تکن رمضانیاً) هەر کەسێك ڕەمەزان بپەرستێ ڕەمەزان دەڕوات ، بەڵام هەر کەسێك کە اللّٰه بپەرستی (اللّٰه حي لا یموت) اللّٰه ﷻ زیندووە و قەت نامرێت، وە نابێت بمرێت نابێ بخەوێت !، خوایەك بخەوێ و بمرێ ئەوە خوا نیە نابێ بپەرسترێت ، بەڵام اللّٰه ﷻ نامرێ بۆیە دائیمەن لەگەڵ عەبدەکانیتی بە عیلمی، بۆیە ئینسانی موسڵمان ئەبێ بەردەوام بێ لەسەر ئەو دینە وە لەسەر عیبادەتی خوای پەروەردگار لە غەیری ڕەمەزانیش.

**خاڵی دووەم :** کە یەکێکە لە نیشانەی خۆشویستنی خوا زۆر زیکرکردنی خوای ﷻبە زمان و بە دڵ، تۆ ئەگەر کەسێکت خۆش بوێ لە مۆبایلیشدا ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾ ناوی لە یەکەم دائەنێی ، ئینجا ناوێکی خۆشت لێ ناوە ، زۆرترین نامەت بۆ ئەوە، زۆرترین قسەکردنت لەگەڵ ئەوە، زۆرترین سەفەرت لەگەڵ ئەوە، زۆرترین چاکەت لەگەڵ ئەوە، دائیمەن دڵت لای ئەوە، بۆ؟ چونکە خۆشت ئەوێ، لەبەر ئەوەی نیشانەی خۆشویستنی خوا ئەوەیە کە دائیمەن زمانت تەربێت بە زیکری خوای ﷻ، عائیشە رضي الله عنهائەفەرمووێ: (يذكر الله على كل أحيانه) لە هەموو کات پێغەمبەر ﷺ زیکری خوای گەورەی کردووە بە دانیشتنەوە بێ بە هەڵسانەوە بێ، هەتا لە ئاودەستیش ﷺ بێ زیکر نەبووە ، لەبەر ئەوە ئینسان لە ئاودەستیشدا ئەتوانێ یادی خوا بکا وەکو ابن القيم و بن باز رەحمەتی خوایان لێبێ دەڵێن: بە س بە دڵ زیکر دەکات!!

زیکری خوا وەکو ئاوە بۆ دڵ ! (الذكر للقلب مثل الماء للسمك فكيف يكون حال السمك إذا فارق الماء) نموونەی زیکری خوا بۆ دڵ وەکو ئاوە بۆ ماسی ، ماسی ئەگەر لە ئاو جیابێتەوە چی لێدێ ؟ ئەمرێ ، وە هەر دڵێکیش لە یادی خوای ﷻ بێ ئاگابی بەیەکجاری ئەمرێ ، زیکری خوای پەروەردگار ئەبی دائیمەن رەبتی بە دڵەکانەوە هەبێ وە بە زمان بەردەوامبێ لەسەر ئەم زیکرە . معازی کوڕی جەبەل رضي الله عنهئەفەرمووێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ چی کردەوەیەك زۆر خۆشەویستە لای خوای پەروەردگار ؟ فەرمووی (أن تموت، ولسانك رطب من ذكر الله) ئەوەیە کە تۆ بمرێ وە زمانت دائیمەن رەبت بێ بە زیکری خوای پەروەردگار، هەندێك لە

سەلەف ئەفەرموون:هەر کەسێ زمانی ڕاهاتبێ لەسەر زیکری خوای ﷻ ئینجا ئەم زیکرە بە دڵ بێ باشترین زیکر ئەوەیە کە بە دڵ زیکری خوای گەورە بکەی ، بەدڵ ئەگەر زمانیشت نەجوڵێ بەڵام ئەگەر زمانیشت بجوڵێ ئەجری زیاترە ، لەبەر ئەوە دەبێ ئینسانی موسڵمان دائیمەن ڕەبتی هەبێ بە زیکری خوای پەروەردگار .

**خاڵی سێیەم:** کە زۆر زۆر زەڕوورە لە سەر ئەوەی بزانی کە ڕاست ئەکەی لەگەڵ خوای ﷻ تۆ دائیمەن کاتێك دابنێی بە تەنیا لەگەڵ خوای ﷻ خەلوە بکەی و موناجاتی لەگەڵدا بکەی ، ئەو کاتەش باشترین کاتە کە سێ یەکی شەوە ، رب العزە بە علیمی خۆی دێتە ئاسمانی یەکەم ئەفەرمووێ: (کێ داوای هیدایەت ئەکا هیدایەتی بدەم؟ کێ داوای لێخۆشبوون ئەکا لێی خۆشبم؟ کێ داوای خواردن ئەکا بیدەمێ ؟ کێ داوای جل ئەکا بیدەمێ؟ خوای ﷻ بێتە ئاسمانی یەکەم کەسێك هەڵنەستێتەوە هیچ گومانی لەوەی هەیە کە درۆ ئەکا لەگەڵ زاتی خوای ﷻ کە خۆشی ناوێ !!! لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان ئەوەی لە بیربێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی بووە پێغەمبەر هەتا مرد واجب بوو لەسەری هەموو شەوێك شەونوێژ بکات ، بۆ ئەوەی مناجات بکا لەگەڵ خوای ﷻ، وە پێشی پێغەمبەرایەتیش ساڵی مانگێك ئەچووە ئەشکەوت یەك مانگ بە تەنیا خوای ﷻ دەپەرست، چونکە ئەگەر تۆ خوات خۆشبوێ دائیمەن دەبێ قسە لەگەڵ خوا بکەی بەتەنیا وە باشترین کاتیش ووتمان شەونوێژە وە ئەو کەسەی شەونوێژی هەبێ با شوکری خوا بکات کە خۆشەویستی خوا لە دڵی زۆرە ! ئەوەشی کە نیەتی با پەنا بگری بە خوا کەوا خۆشەویستی خوا دڵیدا زۆر زۆر کەمە

، بۆیە ئینسانی موسڵمان ژیانی سەلەف وە صەحابە بخوێنێتەوە ، هەموو ژیانیان لە ناو قیام اللیل و لە ناو مناجاتی خوای پەروەردگار بووە بەتایبەت لە شەونوێژدا !!!

**خاڵی چوارەم:** کە نیشانەی خۆشەویستی خوای ﷻ هەر کاتێك ئەو دڵانەی کە خوایان خۆش ئەوێت گوێیان لە کەلیمەی اللّٰە بێ ئیلا دڵەکانیان دەلەرزی ، گوێیان لە عەزابی خوا بێ ئیلا دڵیان دەلەرزی ،

گوێیان لە عقوبەی خوا بێ ئیلا دڵەکانیان دەلەرزی ، وە هەر کاتێك باسی خوای ﷻ کرا ئیلا دڵەکانیان دەگری، ئەوە ڕەمەزان ڕۆیی چەنێکما لە ترسی خوا وە چەنێکمان کاتێك کە ناوی خوا دێ وە چەنێکمان ئەو قورئانە خۆشەی کە ئیستا دەخوێنرا گریاوە بۆی؟ لەسەر چی؟ ئەم عەلاماتە لەسەر ئەوەی کەوا خۆشەویستی اللّٰە لە دڵەکانمان کەمە !!! بەتەحەداش واتا هیچ کەسێك لە منەوە بگرە هەتا غەیری منیش دەتوانی بڵێ خوام خۆش ئەوێ ؟ چەند ئاشقتان بینیوە خێزانەکەی یاخود عاشقەکەی ووتویەتی ئەوە تەواو عیلاقەم لەگەڵت بڕی چەند بە توندی گریاوە؟ چەند کەس خۆی کوشتووە ؟ چونکە ئەو قسەی کردووە ! لەبەر ئەوە نیشانەی خۆشویستنی خوای ﷻ کە ناوی اللّٰە هات دڵت بلەرزی !!! کە گوێت لە ئایەتەکانی خوای گەورە بوو بگری ، کە نەگریاین دڵنیابین لەوەی کەوا خۆشەویستی خوا لە دڵەکانما کەمە ، وە ئەوەش وای لێمان کردووە کە تامی لێ نەکەین !! چونکە هەتا تۆ خۆشت نەوێ تام لە قسەی ناکەی ، کەتامت لە قسەی کرد دائیمەن حەز ئەکەی لە خزمەتی قسەکەی بی یان لە خزمەت قورئاندا یاخود لە نوێژ کردندا ، بۆیە ئینسانی موسڵمان ئەو صیفاتەی لە یاد بێ ، عائیشە رضي الله عنها

وەصفی پێغەمبەر ﷺئەکات ئەفەرمووێ: ( کە نوێژی ئەکرد باسی سینگی ئەکا ئەڵێ واللّٰه هی لەتەنیشتی بووم گوێم لە سینگی بوو سینگی ئەکوڵا وەک چۆن ئاو دەکوڵێ لەسەر ئاگر هەموو گوێتان لێ بووە؟ ئەڵێ سینگی پێغەمبەری خوا بەم شێوە گوێم لێ بوو کە لە تەنیشتی بووم ئەوها بە بەتوندی دەگریا ، چەندین جاریشی پێغەمبەری خوا ﷺ کە درێژترین ریشی هەبووە تەڕبووە ،چونکە یادی خوای بیرکەوتۆتەوە .

**خاڵی پێنجەم:** غیرەت لەسەر ئەوەی ئەگەر گوناهێك کرا بەوەی کە قسە بوترێ بە خوا و بە پێغەمبەری خوا ، ئەبێ غیرەتی گەنجی ئێستا چەنێك بێ؟ کێ لە ئێمە گوێی لێ نەبووە لەم شارەدا قسە بە خوا نەوترێ چەند کەس غیرەتی جوڵاوە، چەند کەس تەنها گریا، ئەوە ئەو پەڕی نیشانەی فەراغی دڵمانە لە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبوبەکری صدیق ؓلە شام بوو (فینحاص) کابرایەکی نەصرانی قسەی بە پێغەمبەری خوا ووت ﷺ، نەیووت من لەناو شاری ئەوانم ئەوان هەموو نەصرانین یان یەهودین لێم ئەدەن !! یەکسەر بۆکسێکی لێدا دەم و چاوی هەموو تێکەڵکرد ، هاتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ئەبوبەکر لێی داوم، ئەبوبەکر ؓ فەرمووی: یارسول اللّٰه قسەی بە تۆ ووتووە .

جارێکیان قوعافەی باوکی ئەبوبەکر ؓ قسە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ، کە هاتە دەرەوە وتی: ئەبوبەکر بۆ لێت نەدا؟ وتی: سوێند بە اللّٰه شمشێرم پێ بوایێ

سەرم لە لاشەی جیادەکردەوە !. لەبەر ئەوەی ئەوان قەبوڵیان نەبووە کەس قسە بە خوای ﷻ بڵێ ، وە کەس قسە بە پێغەمبەری خوا بڵێ ﷺ.

**خاڵی شەشەم:** یەکێك لە گەورەترین نیشانەی خۆشویستنی خوا قورئانە ، قورئان قسەی کێیە ؟ قسەی خوای ﷻ، تۆ ئەگەر کەسێکت خۆش بوێ چەند تامەزرۆی ئەوەی قسەت لە گەڵ بکا یاخود کەسێك قسەی ئەوت بۆ نەقل بکا ؟!! چەند کەس لە ئێمە قورئان ئەزانێ بە جوانی بیخوێنێتەوە ؟ چەنێکی لەبەرە ؟ چەند تەفسیری قورئان ئەزانی؟ چەنێك تەنها سورەی فاتیحەی بە تەفسیرەوە لەبەرە بە تەرجومەوە نا ؟ ئایا ئەوە نیشانەی ئەوە نیە خۆشەویستی خوا لە دڵەکانما کەمە؟ ئایە ئەوە نیشانەی ئەوە نیە کە فاتیحە سەد جاریش بیخوێنرێ ئێمە نەگرین؟ ابن العباس رضي الله عنه هەر کاتێك گوێی لە ئایەتی ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ دەبوو لە هۆش خۆی دەچوو !!! وتیان: بۆچی یا ئیمام لە هۆش خۆت دەچی؟ فەرمووی: ئەترسێم لە دوای سەلام دانەوە بڵێم خوایە تۆ ئەپەرستم بەڵام جگە لە خوا بپەرستم، کام لە ئێمە غەیری خوا ناپەرستێ ؟ بەڵام ئەوەندەی نەگەیشتۆتە حەدی کوفر، چەند جار نەفسمان پەرستووە؟ چەند جار پارەمان پەرستووە؟ چەند جار خێزانی خۆمان پەرستووە؟ چەند جار باوکمان پەرستووە؟ چەند جار حیزبەکەی پەرستووە ؟ چەند جار سەرکردەکەی پەرستووە ؟ ئەمە هەمووی پەرستنە ئەوانە هەموو وایا نکردووە دڵەکان لە ڕەمەزانیشدا نەگری! دڵەکان لە ڕەمەزانیشدا بەرەو خوا نەچی ! بۆ ؟ چونکە ئەو خاڵانەی هەر هەمووی کە باسمان کرد ئەزانین کە چەنێکمان تیایە ، چەنێکیشمان تیا نیە ؟

**خاڵی حەوتەم:** کە زۆر زۆر زەرووره لە گەورەترین نیشانەی خۆشەویستی خوای پەروەردگارە ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ (بۆ نموونە تۆ کەسێکت خۆش بوێ وەک خێزانت کە دەچیتە دەرەوە زوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خێزانی خۆت ببینی کە خۆشەویسترین کەستە، ئینجا وەرە سەر مناڵەکەی، ئینجا وەرە سەر ئیشەکەی، وەرە سەر سەیارەکەی هەر شتێکت کە خۆشت دەوێ تەمەننا ئەکەی زوو بیبینی، زوو پێی بگەی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: (من أحب لقاء اللّٰه أحب اللّٰه لقاءه، ومن كره لقاء اللّٰه كره اللّٰه لقاءه) چۆن ئینسان لیقای اللّٰه ی خۆشدەوێ؟ بەوەی کە تۆ ئەو پەری تاعەت و ئەو پەری عیبادەتت و خوا پەرستی بکەی، وە شتێك نەکەی ببێتە ڕێگر لە لیقای خوای پەروەردگار، لە نیشانەی خۆشویستنی لیقای خوای پەروەردگار خۆشویستنی مردنە ! تۆ حەز بکەی بمرێ کە (مستعدی) وە یەك شت ماوە تۆ بگەی بە لیقای خوایەکەت ئەویش ئەو مردنەیە ، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە جوبرئیل دابەزی ملك الموت ویستی روحی بکێشی یەك کەلیمەی بەکارهێنا فەرمووی (في الرفيق الأعلى) واتا لای خوام پێ خۆشترە ! خۆ ئەگەر داوای بکردایە خوای گەورە تەمەنی درێژ دەکرد ، بەڵام بۆ خوای ﷻ داوا کرد؟ ، چونکە ژیانی لای خوا خۆشترە، ئەگەر کەسێك ژیانی لەگەڵ خوا بێ ژیانی ئەوەندە خۆشە وەک ئەوە وایە لە بەهەشتدایە زاتی خوا ئەبینێ ، چی شتێك لەوە خۆشترە کە جومعە دێ و تۆ خوا ئەبینی! دڵ ئەگەر بەوە خۆشبێ تۆ عەبدێك ببینی کە نە زەرەر و نە قازانجی تۆی بەدەستە زۆر جاریش دڵت ڕەق ئەکا زۆر جار زەرەریشت پێ ئەگەینێ کە دڵت پێی خۆش ئەبێ.

لەبەر ئەوە ئینسانی موسڵمان چاوی لەوە بێ کەوا لیقای خوای پەروەردگار لە دڵیا بێ، نیشانەی تریش زۆرە کە بەڵگەن لەسەر خۆشەویستی خوای عزوجل، بەڵام ئەمانە بە کورتی بوون، چونکە ئەگەر ئینسان ئاقڵ بێ یەك ئیشارەی بەسسە ، لەبەر ئەوە ئەمە تەزکیرەیەکە بۆ خۆم دواتریش بۆ ئێوە ، ئینسانی موسڵمان ئیزن نەدات غەیری خوای پەروەردگار خۆشەویستی بچێتە دڵی، چونکە دڵ خاوەنەکەی اللە یە، وە دڵی ئێمە دائیمەن بۆ دڵتەنگە ؟ بۆ دائیمەن غەمبارە؟ دائیمەن غەمی هەیە؟ دائیمەن حەزینە؟ دائیمەن ڕەشە ؟ چونکە غەیری خوای پەروەردگاری تیایە ، بەڵکو جاری وایە خۆشەویستی غەیری خوای پەروەردگاری تیایە زیاتر لە خوا

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ ﴾

خەڵکانێك هەیە ئەوەندە خەڵکیان خۆش ئەوێ زیاتر لە خوا یاخود بە قەدەر خوا بەڵام ئیمانداران گەورەترین وە زۆرترین وە پتەوترین خۆشەویستیان بۆ کێیە ؟ بۆ اللە یە عزوجل.

لەکۆتایدا دەڵێم: یا اللە بۆ خاتری ناوی جوانت خۆشەویستی خۆت بخا ناو دڵەکانمانا، خوای گەورە بۆ خاتری ناوی جوانت خۆشەویستی غەیری خۆت لە دڵمان دەربکە هەتا وەکو دەگەین پێت، خوایە بۆ خاتری ناوی جوانت خۆشەویستی خۆت بخەیتە دڵمان وە بمان کەی بە خۆشەویستی خۆت، یاڕەبی خوایە داوات لێ ئەکەین بە ناوی جوانت تەنها خۆشەویستی خۆت لە دڵمانا جێگیر بکەی خوایە دوعایەکی تایبەتی ترت لێ دەکەین ئەگەر خۆشەویستی تۆ

ڕۆژێك لەسەر دڵمان دەربچێ یاخود خۆشەویستی غەیری تۆ زیاتر لە دڵمان جیگیر بێ یاڕەبی خوای پەروەردگار ئێستا روحمان دەر بکەی، پەنات پێ ئەگرین لە ڕۆژیك کە غەیری تۆمان زیاتر خۆشبوێت، خوای گەورە بۆ خاتری ناوی جوانی وامان لێ بکا خۆشمان بوێ وە گەورەترین خۆشەویستی خۆشی دابەزێنیتە سەر دڵەکانمان وە قەبوڵمان بکات بە عەبدی خۆی .

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم

